زنجیرەی :

با چاکتر ئیسلام بناسین !



ئاڵقەی دەیەم

# کۆمەڵی خوا

( حزب اللّه )

پێناسەی بزووتنەوەی ئیسلامی

نووسینی : علی باپیر

١٤٠٨ ک _ ١٩٨٨ ز

لە بڵاوکراوەکانی بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق دا

پێشکەشی بەڕێز
کاک
داوە
٥ی شعبانی ١٤٠٨
شاخی قەندیل

بسم اللـه الرحمن الرحيم

## پێشکەش بێ

*************************

بە هەموو مسولمانێکی ڕاست و ساغ . مەلا بێ ، قوتابی بێ ، کرێکار بێ ، سۆفی بێ ، شێخ بێ ، دەروێش بێ ، حاجی بێ ، سەیید بێ ، میرو بەگ بێ ئاغا (١) بێ ، کوێخا بێ گەدا بێ ... هەرچی بێ ..

بە مەرجێك بڕوای وا بێ ! تاقە ناوێك کە بەرنامەی خودا بۆ بڕوادارانی پەسند کردوە بەس ( مسولمان ) ە و ، سەنگی مەحەکی چاکی و خراپی و بەرزی و نزمیش بەس تەقوایە و ، وێڕای ئەمەش ئامادە بێ سەرو مالی لەپێناوی هەستاندنەوەو بووژاندنەوەی بەرنامەی خودا دا دانێ .

---

(١) لێرەدا مەبەستمان لە کەسانێکە کە ئەو ناوانەیان بە عورفی کۆمەڵگا لێ بوون بە شۆرەت و پێیەوە دەناسرێن ، نەك ئەوانەی ئاغایەتی و میرایەتی بەسەر خەڵکی دا دەکەن و ، دەڵێن دەبێ خەڵك دیل و کۆیلەو نیوەکاری ئێمە بێ !! .

## دوو تێبینی

***************

یەکەم : ئەم نووسراوە بەردێکە دوو نیشانەی پێ پێکراون یەکەم : پێناسەیەکی کورتی بزووتنەوەی ئیسلامی یە دووەم : ئاڵقەیەکە لە زنجیرەی ( با چاکتر ئیسلام بناسین !) چونکە ئەم ناميلکەیە سەرەرای ئەوەی کە بزووتنەوەی ئیسلامی پێناسە دەکات لەژێر سەرباسێکدا بەناوی ( رێ خۆش کردن ) خەسلەت و نیشانەو درووشمە بنەرەتی یەکانی کۆمەڵی خوا ( حزب الله ) ش دەخاتەروو، جا هەم ( رێ خۆش کردن ) ەکەش و هەم ( پێناسە )کەش دەورێکی بەرچاو و پێویست دەبینن لە پەردە لەسەر لادان و خستنەرووی چەمك و واتای راستەقینەی زاراوی ( حزب الله )، ئەو زاراوە گرنگەی کە وەك هەموو ئەو زاراوە گرنگ و بنەرەتی یەکانی دیکەی ئیسلام تەم و مژو تۆزو خۆڵێکی بێرەزای لێ نیشتووە و رووی رەسەن و درەوشاوەی حەشار دراوە .

دووەم : ئەم نووسراوە بیرورا و تێروانینی ( بەندە ) یەو بزووتنەوەی ئیسلامی بەرپرسیار نیە سەبارەت بەو تێروانین و بۆچوون و هەڵوێستانەی تێیدا خراونەتەروو روونتر بڵێم : ئەم نووسراوە بیرو بۆچوون و تێروانینی تایبەتی یەکێك لە ئەندامانی بزووتنەوەی ئیسلامی یە نەك تێکرای ئەندامانی، کەواتە لەکاتی هەبوونی رەخنەو تێبینی یەکدا پێویستە رووی رەخنە لە نووسەر بکرێ - وەك کەسێك - نەك تێکرای ئەندامانی بزووتنەوەی ئیسلامی .

# پیشەکی

سوپاس و شوکرانەیەکی بێسنوور بۆخوای تاکی لە لەکەدوور، پشتیوانی بڕوادارانی چاکەکارو، پشتشکێنی بێبڕوایانی زۆردارو بەدڕەفتار، خوایە بەزەیی و سۆزو بەیت و بێزت دابارێنە سەر گیانی بەرزو پیرۆزی پێغەمبەرانی پایەبلیندو بەڕیزت، چاوساغانی مرۆفایەتی و پێشەوایانی موسولمانەتی، بەتایبەتی براگەورەیان و گەورەمان موحەممەدی خۆشەویست و سەروەرمان، ئەیتان بەزێنی طاغووت ڕەتینی زوردارخەسێنی بتشکێنی نەفامیڕەوینی ئازادی هێنی دادگەری چەسپێن و، خزمانی پاك و پەسندی و برادەرانی پاك و ڕەندی و شوێن کەوتووانی ڕاست و وەفادارو پارێزگارو جەرگداریان.

خوێنەری خۆشەویست!

خوای میهرەبان و تۆلەستێن بەمەبەستی لووتشکاندنەوەی فیرعەون (فرخو) ی خۆبەخوازانی میسرو قوتارکردنی گەلی ستەمدیدەو ژێرچەپۆك و نیرلەسەرشانی "بنی اسرائیل" مووسای علیه السلام ناردەلاو پێی فەرموو: (اذهب الی فرعون انه طغی) طه/ ٢٤.

بەڕۆلای فیرعەون چونکە یاخی بووە!

جا کاتیك مووسای هەڵگری پەیامی خوداو، مووسای مژدەو مزگێنی ئازادی پێ بو گەلە ژێردەستو چەوسێنراوەکەی، چووە لای فیرعەون و پێی گوت: (انا رسولا ربك

فأرسل معنا بني إسرائيل ولا تعذبهم ..) طه / ٤٧ . ئیمە ـ من و هاروونی بـــرام ـ
پێغەمبەری پەروەردگارتین و جا وەچەی ئیسرائیلمان لەگەڵ بنێرەو ئەشكەنجەیان مەدە ..!!
فیرعەون لە سونگەی ئەوەوە كە خۆی بە تاقە خوداو (١) بەرزترین پەروەردگـــاری (٢)
ئەڵكەكە دەزانی، بەسەرسوورمانەوە یان بەخۆگێل كردنەوە لە مووساو هاروونی برای پرســی
ـ سەلامی خوایان لێ بێ ـ :( فمن ربكما يا موسى ؟! ) طه / ٤٩ .
جا ئەی مووسا پەروەردگارتان كێ یە ؟!
مووسا سەلامی خوای لێ بێ فەرمووی :( ربنا الذي أعطى كل شئ خلقه ثم هدى ) طه / ٥٠
پەروەردگارمان ئەو زاتەیە كە بوونی بە هەموو شتێك بەخشیوەو دوایی ڕێڕوونی كـــردوە
ـ بەرنامەی بەڕێوەبوونی بۆ داناوە ـ .
لێرەدا مووسای بەڕێز سەلامی خوای لێ بێ بە بەردیكی دوو نیشانەی پێكاوە :
یەكەم : بەڵگەهێنانەوە لەسەر سەلماندنی بوونی خودا .
دووەم : بەڵگەهێنانەوە لەسەر پێویستی هەبوونی ڕێڕوونیو ڕێ پیشاندەر ، لەلایـــەن

---

(١) ( قال لئن اتخذت إلهاً غيري لأجعلنك من المسجونين ..) الشعراء / ٢٩ .
(٢) ( فقال أنا ربكم الأعلى ) النازعات / ٢٤ .

خواوه بۆ مرۆڤایەتی ۰ ( واتە سەلماندنی دوو بنچینە لە سێ بنچینەکانی بیروباوەڕی ۰۰۰ ئیسلامی : خوا بەیەکزانین ، پێغەمبەرایەتی ، دوارۆژ ( التوحید ، النبوة ، المعاد ) ۰

چونکە کە دەفەرموێ : خودا هەرچی خولقاندوویەتی ڕێڕوونیشی کردوە بۆ چۆنیەتی بەڕێوەچوونی سەرنجی فیرعەون بۆ ئەوە ڕادەکێشێ کە بوونەوەرو هەرچی تێیدایە یاسادار ( منظم ) و ئامانج دار ( ذو هدف ) ە ، هەڵبەتە هەبوونی ڕێک و پێکی ( نظام ) و هاتنەدی ئامانجێکی ویستراوی لەهەر شتێک دا ، بەڵگەیەکی پتەوو بێ پێ ، و پەنایە لەسەر بوونی زاتیکی یاسادانەرو ڕێکخەرو خاوەن ئامانج و مەبەست ۰

دیسان کە فەرموویەتی : خوا هەرچی خولقاندوویەتی ڕێگەشی پیشان داوەو ڕێروونیشی کردوە ، مەبەستی ئەوەیە ، کە مرۆڤ نابێ لەو یاسا گشتیە ڕێزپەڕ ( شاذ ) بێ ، چونکە ""کل شئ "" هەموو شتێک دەگرێتەوەو ئینسانیش نەک هەر ( شت ) ە !! بەڵکو گەورەترینو بەڕێزترین ( شت ) ەو ، سەرتۆپی کائینات و شاگوڵی باغی بوونەوەرە ۰

بەڵێ جا خوێنەری سەنگین !

لەڕاستیدا وەک مووساو هەموو پێغەمبەرانی دیکەی پایەبەرز علیهم الصلاە والسلام فەرموویانە خوای کاربەجێ و زاناو تواناو میهرەبان هەر وای لێ چاوەڕی دەکرێ

که هەروەك چۆن هیچ شتێکی پشت گوێ نەخستوە، مرۆڤیش، دروستکراوی ڕێزلێ گیراو و بە جێگردانراوی ... ، پشت گوێ نەخاتەوە لە ڕێڕەوونی و تیشکی خوێ بێ بەشی نەکات و وای لێ نەکات چاو لە دەستی غەیری وی بێ، وەك هەموو دروستکراوەکانی دیکە بەرنامەو پەیرەوو نەخشەی ژیان و گوزەران و بەڕێوەچوونی بۆ دابنێ.

جا واقیعیش هەر وا بووەو لە بەرەبەیانی سەقامگیربوونی مرۆڤەوە لەسەر خڕۆکەی زەوی، خودا لەهەر چاخ و ڕۆژگارێك دا، چاکترین و پەسندترین و کامڵترین مرۆڤی ئەو چاخ و سەردەمەی هەڵبژاردوەو، کردوویەتی بە نوێنەری خوێ و، ڕێڕەوونی کەری بەندەکانی، وەك فەرموویەتی: (وَلَقَد بعثنا في كل امةٍ رسولاً ان اعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت..) النحل/ ٣٦.  وە بێگومان لەهەر کۆمەڵێك دا پێغەمبەرێکمان ناردوە کە - پێیان ڕابگەیەنە- خوا بپەرستن و خۆتان لە طاغووت دووربگرن..

جا مرۆڤایەتی وەك قوتابیانی قوتابخانەیەك وابووەو، ئەو زاتە بەرزو بەڕێزانەش وەك چەند مامۆستایەك دینەبەرچاو، کە هەرکامیکیان لە پۆلێکی ئەو قوتابخانەیەدا دەرسی گوتبێتەوە..

چونکە هەر قوناغێك لە قوناغەکانی ژیانی مرۆڤایەتی، وەك پۆلێك وایە لە پۆلەکانی قوتابخانەیەك و هەر پێغەمبەرێکیش مامۆستای قۆناغێك بووە لە قۆناغەکانی ژیانی

مرۆڤایەتی .

ئنجا دوا پۆلی قوتابخانەی مرۆڤایەتی ئەو قۆناغە بوو کە دوایین پێغەمبەر (خاتم النبیین) - محمد المصطفی - صەلات و سەلامی خوای لێ بێ ماموستاو چاوساغی بوو، هەر بۆیەش بە هاتنی ئەم پێغەمبەرە پایەبەرزە، بەرنامەو پەیرەوی هەموو قۆناغەکانی پێشوو، یان کتێب و دەرسی هەموو پۆلەکانی رابردوو لەبیرەو کەوتن و بێ ئیعتیبار بوون، چونکە سەرەرای ئەوەی کە دەستی پیس و نەگریسی گۆرین و دەستکاری کردن "التغییر والتحریف" هیچی بەسەر هیچەوە نەهێشتبوون، هەر کامێك لەو بەرنامانەش دەرس و بەرنامەی پۆل و قۆناغە سەرەتاییەکانی مرۆڤایەتی بوون و، ئاشکراشە دوای ئەوەی قوتابی گەیشتە پلەی زانکۆ (جامعە) و خوێندنی بالا ماقوول نیە بگەرێتەوە بۆ خوێندن و موتالای ئەو پۆلە سەرەتاییانەی کە هەڵی بواردوون !!

بەلام جا هەرچەندە ئەو بەرنامەو پەیرەوانە کە خوای بە بەزەیی بە نوێنەرانی خۆی دا بۆ مرۆڤایەتی رەوان کردوون، لەگەڵ عەقڵ و زانیاری راست و سروشتی ساغ (الفطرە السلیمە) دا گونجاوو پێکەلپێکن، بەلام مرۆڤ فریشتە نیەو، چونکە خوا بە مەبەستی تاقی کردنەوەو هەلگرتنی باری جێگرایەتی و سپاردە "امانە" ی قیمورس

خوڵقاندوویەتی، وێرای چاکەخوازی خراپەخوازیشی تێدایە .

بۆیە دەبینین بە درێژایی مێژوو وێرای بەرەی هەقی خواپەرستان، بەرەی ناهەقی خۆپەرست و بت پەرست و طاغووت پەرست و ...چی و چی پەرستانیشله گۆڕێ دا هەبووە و هەر لە ڕۆژی بەرێ وە ئەو دوو بەرەیە دەبەرێک دا بوون و، بەرەی هەق ویستوویەتی بۆ جێ بەجێ کردنی ئەرکی بەندایەتی سەبارەت بە خودا و، وەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوا و بەهەشتی بەرین، هەوڵی چەسپاندنی بەرنامەو حوکمی خودا بدات لەسەر زەوی دا، کە چەسپاندنیشی دادگەری و ئازادی و یەکسانی لە گرەودایە، بەرەی ناهەقیش وەك شیشەمەکوێرەی بە ڕوونا کی قەڵس ویستوویەتی بۆ قایل کردنی نەفس و شەیتان و طاغووت، هەوڵی پەیدا کردنی هەوری ڕەش و چڵکن بدات بۆ گرتنی بەری ڕۆژی ئایین و ... بەرنامەی خودا و هەوڵی چەسپاندنی ڕژێم و حوکمی طاغووتی و نەفامی بدات، کە نەمانی دادگەری و ئازادی و یەکسانی و ڕەوشت بەرزی و پەیدا بوونی بێدادی و چەوسانـ ـدنەوەو چینایەتی و بێ ڕەوشتی و خراپەکاری لە هەگبەدایە .

چا هەروەك چۆن زانایانی فیزیا و کیمیا دەڵێن ماددەو جووڵان ( المادة والحركة ) وەك جەستەو سێبەرەکەی دوو شتی پێکەوە بەستراون و لێك جوێ نابنەوەو شتاقیان بێ شتاقیان بوونیان نابێ، لەراستی دا ئەم یاسایە بەس لە بواری گەردیلەو گەردو

توخمەکان دا فەرمانڕەوا نیە، بەڵکو لە سەرتاسەری دیاردە سروشتی یەکسانی
بوونەوەردا لە ئارادایەو، لە دنیای مرۆڤیش دا بە زەق ترین شێوە دەبینرێ .

بۆ وێنە : دەبینین "" ئاو "" بەو پاکی و شیرینی و زولالی یەی خۆیەوە کە بۆ
پاککردنەوەی هەموو شتێك بەکاردێ، لە ئەنجامی ڕاوەستان و نەجوولان دا حەقیقەت و
نێوەڕۆکی خۆی لەدەست دەداو، بۆگەنیو دەبێ وەوای لێ دێ دەبێتە کانگەی میکرۆب و
دەردو نەخۆشی و شتی پیس و بە هیچ شتێکیش پاك نابێتەوە .

بەڵێ جا هەروەك چۆن نەجوولان و نەبزووتن و ڕاوەستانی هەر شتێك یەکسانە بە
مردن و لەنێوچوون و نەمانی ئەو شتە، بوون و بەردەوامی بەڕەی هەقیش لە گرەوی جوولان و
بزووتن و ڕەنج و خەبات دایە، دەنا ئەویش بەهۆی نەجوولان و دانیشتن و ڕەنج نەدانەوە
بۆگەنیو دەبێ و، دەبێتە زبڵدانێك کە سەدان جۆرە گەرای پیس و بەدی تێدا دەترووکێ،
بەهۆی ژێرچەپۆکی و نیر لەسەرشانی یەکەوە کە لە لایەن ڕژێمی طاغووتی و نەفامی و خۆ
بەخوازانی زۆردارو چەوسێنەرەوە بەسەری دا دەسەپێنرێ .

بۆ وێنە :

هەر واقیعی ئێستای گەلی کورد کە نموونەیەکە لە واقیعی تێکڕای گەلانی دیکەی
ئومەتی ئیسلامی ؛ دەبینین گیرۆدەی دەیان دەردی کوشندەو ماڵ کاولکەری وا بووە کە

ئەگەر بێت و چارەسەر نەکرێن تێدا چوون و بێ سەروشوێن بوونی شتێکی مسۆگەرو حەتمییە ٭ ڕاست وەك بەدوای یەك دا هاتنی پێشەکی و ئەنجامێکی زیربێژی یا نەبەڵێ جاشەتی ، بێ بڕوایی ، طاغووت پەرستی ، چینایەتی ، تیرەگەرایەتی ، پیاوکوژی ، ڕێگری دزی ، داوێن پیسی ، مەیخواردنەوە ، قومار ، بەرهەڵدایی ، بێ شەرمی ، درۆ ، فێڵ ، بێـ ـوەفایی ، بەڵێن شکێنی ...هتد ، چەند نەخۆشی و دەردێکن کە لە سۆنگەی حوکم کردنی ڕژێمی طاغووتی و نەفامی و حیزب و ڕێچکەو بیردۆزەی شەیتانی و مرۆڤکردەوە لەنێو گەلانی ئیسلامی دا بەگشتی و گەلی کوردمان دا بەتایبەتی پەیدابوون و بژاروگیا ـکەڵەی کۆمەڵگان و مرۆڤایەتی گەندەڵ دەکەن و لەبنی دێنن .

بەڵام وەك گوتمان هەموو دەردو نەخۆشی یەك بەهۆی میکرۆب و گەرایەکەوە پەیدابوو ون کە لە زۆنگەو زەلکاوی حوکم کردن بە ڕژێم و حوکمی طاغووتی و نەفامی دا ترووکاون ؛ واتە لە ئەنجامی ئەوەوە کە بەرەی کوفرو ناهەق دەسەڵاتی ناڕەوای خۆی بەسەر خەڵکی دا سەپاندوەو نیری زۆرداری هاویشتوونە سەر شانیان ، ئنجا هۆی هاتنە گۆڕی بەرەی ناهەق و خۆبەسەر خەڵکی دا سەپاندنیشی ، پەندێکی پێشینان ڕوونی دەکاتەوە کە دەڵێ : (( ئەگەر پشیلە لەماڵ نەبوو مشکان تلی لی یانە! )) کەواتە لە مەیدان دا نەبوونی بەرەی هەق ، بۆتە هۆی سینگ هێنانەپێش و خۆگیف کردنەوەو خۆ

بادانی بەرەی ناهەق و گۆزەشرچی تێدابێ هەر ئەوەی لێ دەڕژێ و واقیعێك كە لەنێو گەلی کوردو گەلانی دیکەش دا دەیبینین ، بەرهەمو پەرێزی حەتمیو ئاسایی حوکم‌کردن و دەستە ـ لاتداریەتی بەرەی ناهەقە ۰

هەر بۆیەش سەرکردەی تێکۆشەران و مامۆستای شۆڕشگێڕان صلی اللە علیه وسلم فەرموویەتی: ( لن یبرح هذا الدین قائما تقاتل علیه عصابه من المسلمین حتی تقوم الساعه ) رواه مسلم ۰ واتە ئەم ئایینە هەر بەردەوامو ڕاوەستاو دەبێ ، کۆمەڵێك لە مسوڵمانان جەنگی لەپێناودا دەکەن هەتا قیامەت دادێ ۰

بەڵێ مانەوەی ئەم ئایینەو ڕاوەستاوی ئەم بەرنامە تێروتەواوەی خودا کە مایەی مانەوەی مرۆڤایەتی‌یەو ڕاوەستاوی مسوڵمانان و هەبوونی خواناسیو دادگەری و یەکسانیو ئازادی و ڕەوشت بەرزی یەلە گرەوی ( جهاد ) دایە ، لە گرەوی هەبوونی کۆمەڵە مسوڵمانێکی جەنگاوەرو شۆڕشگێڕو فیداکاردایە ۰

جا خوێنەری سەنگین !

ئێمە ( بزووتنەوەی ئیسلامی ) خۆمان بەو کۆمەڵە مسوڵمانە جەنگاوەرو شۆڕشگێڕو فیداکارە دەزانین ، کە پێغەمبەری پێشەوا صلی اللە علیه وسلم بە تاقە هۆی مانەوەو ڕاوەستاوی ئایین و بەرنامەی خودای داناون ۰

ئەم بۆ برادەی بەردەستیشت بنیابەر یەکی کورت و پوختی بۆ ووتەنەوەی بەیتلاکی بە

بە ئومیدی ئەوەی کەسانێك کە عەودال و شەیدای دیتنەوەی هەقن بەمراد بگەن و بەهرە ـ مەند بن و بە بەرەی هەقەوە پەیوەست بن •

( والذین جاهدوا فینا لنهدینهم سُبلنا وإن الله لمع المحسنین ) العنکبوت •



٥ /جەمادی دووەم/١٤٠٨کۆچی

بناری قەندیل

## ڕێ خۆشکردن

**************

خوێنەری سەنگین !

بێگومان (بزووتنەوەی ئیسلامی ) (( الحركة الأسلامية )) لە کوردستانی عێراق دا بێ (1)
لە هەر پارچەیەکی دیکەی سەرزەوی خوادا بێ ، خۆی بە کۆمەڵو پێری خودا ( حزب
یان لە هەر پارچەیەکی دیکەی سەرزەوی خوادا بێ ، خۆی بە کۆمەڵو پێری خودا ( حزب
الله ) لە قەلەم دەدات ، مادام وایە با بەرلەوەی بێینە سەر پێناسەکردنی ئەو کۆمەڵ و
بزووتنەوە ئیسلامی یە تایبەتی یەی کە ئەمڕۆ لە کوردستان دا پەیدا بووە ، بچینە
خزمەت قورئانی بەهێزو پڕپێزو سوننەتی پێغەمبەری بەڕێزو صلی الله علیه وسلم
بزانین بەگشتی چۆن باسی کۆمەڵی خودا و بزووتنەوەی ئیسلامی دەکەن و ئەو درووشم و
نیشانە تایبەتی یانە چین کە قورئان و سوننەت هەبوونیان بە مەرج دەگرن لە
کەسانێک دا کە خۆیان بە کۆمەڵی خودا و بزووتنەوەی ئیسلامی حسێب دەکەن .

---

(1) وشەی (حزب ) وەک خاوەنی ( لسان العرب ) دەڵێ (( بە کۆمەڵە کەسێک دەگوترێ
کە دڵ و کردەوەکانیان وێک بچن .) بڕوانە بەرگی 1 لاپەڕە ( ٣٠٨) .
ئەم وشەیە (٢١) جار لە قورئانێ دا دووبارە بۆتەوە لەو (٢١) جرە(١١) جاران بە
ڕێژگە( صیغە ) ی کۆ ئاوا ( الأحزاب ) وە هەر یازدە جاران بۆ پێرو کۆمەڵە کافرو
لاڕێ یەکان بەکار هێنراوە ، دوو جاریشیان بە وشەی (کل ) واتە : هەموو کراوە بە
کۆ (جمع ) ئاوا ( کل حزب ) وە دیسان هەر بۆ پێرو تاقمە نائیسلامی یەکان بەکار
هاتوە ، وە دوو جارنیش بە (حزب الشیطان ) هاتوەو جارێکیش هەر بۆ پێرو تاقمەی

شەیتان بە (حزبە) هاتوە و (انما یدعوا الذين حزبه) یەکجاریش بە (حزبین) هاتووە،
بەڵام مەبەستی پێ دوو کۆمەڵە خەڵکە، نەک کۆمەڵی خوا و کۆمەڵی شەیتان. وە وشەی
ناوبراو سێ (٣) جار ئیش بۆ کۆمەڵی خوا بەکارهێنراوە بە وشەی (حزب الله).

جا لێرەدا جێی سەرنج و رامان ئەوەیە کە بەزۆری پێڕو تاقمەکانی شەیتان بە (الاحزاب)
ناونراون، هۆی ئەمەش ئەوەیە کە کوفرو بێدینی پێڕو تاقمی جۆراوجۆری هەن، بەڵام
هەرچەندە لە ناوو رواڵەتدا یەکن، لەنێو خۆیاندا لێکجوێ و پێکەوە دژن.

بەڵام کۆمەڵی خوا بەس یەکە لە ناوو نێوەرۆکدا.

لە کۆتاییدا دەڵێم: هەرچەندە پێڕوتاقمە شەیتانییەکان ئەم وشەیەیان وەک زۆر وشەی
دیکە - بۆ وێنە (سیاسەت) - دزیوو ناقۆڵا کردوە، بەڵام مادام قورئان بۆ کۆمەڵی خوا
(حزب الله)ی بەکارهێناوە، ئێمە وازی لێ ناهێنین و دەست بەرداری نابین،
بەڵام خوا پشتیوان بێ بە پەیدابوون و هاتنە نێو مەیدانی کۆمەڵی جەنگاوەری خودا
ئەم وشەیەو زۆر وشەی دیکەش ئابڕوویان بۆ دەگەڕێتەوەو دەبنەوە کاکڵدار !!!

وشەی ( حزب اللە ) کۆمەڵی خوا ، لە قورئانێ دا سێ جاران هاتوە جارێکیان لە سوورەتی ( المائدە ) داو دوو جاریش لە سوورەتی ( المجادلە ) دا .

لە سوورەتی ( المائدە ) دا بەم شێوەیە :

( یا ایها الذین آمنوا من یرتد منکم عن دینه فسوف یأتی الله بقوم یحبهم ویحبونه اذلة علی المؤمنین اعزة علی الکافرین یجاهدون فی سبیل الله ولا یخافون لومة لائم ذلك فضل الله یؤتیه من یشاء والله واسع علیم . انما ولیکم الله ورسوله والذین آمنوا الذین یقیمون الصلاة ویؤتون الزکوة وهم راکعون . ومن یتول الله ورسوله والذین آمنوا فان حزب الله هم الغالبون . ) المائدە ـ ٥٤ ٥٥ ٥٦ .

واتە :

ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە هەر کامێکتان لە ئاینەکەی هەڵگەڕێتەوە ـ خوا پەکی پێ ناکەوێ ـ ئەوە خودا کومەڵێک دەرەخسێنێ ـ بۆ بوژاندنەوەو بەرێوە بردنی بەرنامەکەی ـ کە خۆشی دەوێن و خۆشیان دەوێ ، لەراست بڕواداران نەرمو گەردن کەچن ، لەسەر کافران ڕەق و پەدەمارن ، لەرێ ی خوادا تێ دەکوشن وە لەسەرکۆنەی هیچ سەرکۆنەکەرێک باکیان نیە ، ئەوە بەخششی خوایە دەیدات بە هەرکەسێک کەبیەوێ ، وە خوا فراوان ـ ە لە دەستەلات و بەزەیی و هەموو سیفەتێکی پەسندا ـ و زانایە .

بێگومان پشتیوانتان بەس خواو پێغەمبەرەکەی و ئەوانەن کە بڕوایان هێنـــاوە ئەوانەی نوێژێ بەرپا دەکەن و زەکاتێ دەدەن و زۆر ڕکوعێ دەبەن ، وە هەرکەســـێك دۆستایەتی خواو پێغەمبەرەکەی و ئەوانە بکات کە بڕوایان هێناوە ئـــــــــەوە - کۆمەڵی خودایەو - بێگومان بەس کۆمەڵی خوداش زاڵ و سەرکەوتوون .

لە سوورەتی ( المجادلة ) ش دا فەرموویەتی :

( لا تَجِدُ قوماً یؤمنونَ بِاللّهِ والیومِ الآخرِ یوادّون مَنْ حادَّ الله ورسولَهُ ولو کانـــوا آبائَهم او أبناءهم او اخوانَهم او عَشیرتَهمْ اولٰئك کتب فی قلوبـهـــم الأیمان وأیّدَهم بروحٍ منه ویدخلهم جنّاتٍ تجری من تحتها الانهار خالدین فیهـــا رضیَ الله عنهم ورضوا عنه اولٰئك حِزْبُ اللهِ الا إنَّ حزب الله هم المفلحون ) ٢٢ .

واتە :

هیچ کۆمەڵێکت دەست ناکەوێ کە - بەراستی - بڕوایان بە خوداو ڕۆژی دوایـــی هێنابێ،و دۆستایەتی کەسانێك بکەن کە دوژمنایەتی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن، بـــا ئەو کەسانە بابیان یان ڕۆڵەیان یان برایان یان تیرە - و نەتەوە - یان بن، ئەوانـە - کە دۆستایەتی دوژمنانی خواو پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ناکەن - ( خــوا جل جلالــه ) بڕوای لــە دڵ دا چـــــەســـــپانـــــدوون

وە بە ڕووحێك لە لایەن پشتگیری کردوون - و دڵی بەهێز کردوون - وە دەیانباتە چەند باغێکەوە کە ڕووبارییان بەبن دا دەڕۆن تێیاندا دەمێننەوە خوا لێیان ڕازی یەو ئەوان لێی ڕازین کەواتە کۆمەڵی خودان ئاگادار بن بەس کۆمەڵی خودا سەرفرازن .(١)

---

(١) لێرەدا مەبەست لە وشەی ( روح ) قورئانی بەڕێزو پەیامی خوایە وەك لە سوورەتی ( الشوری ) دا فەرموویەتی : ( وكذلك أوحينا اليك روحاً من امرنا ) - ٥٢ واتە : وە ئاوا ڕووحێکمان لە لایەن خۆمانەوە بۆ تۆ ڕاگەیاند .

وە لە سوورەتی ( النحل ) دەفەرموێ : ( ينزل الملائكة بالروح من امره على من يشاء من عباده ...) ٢ . واتە :

فریشتان بە ڕووحێك لە لایەن خۆیەوە دەنێرێتە خوار بۆسەر هەر کەسێك کە بیەوێ لە بەندەکانی .

هۆی ناونرانی بەرنامەو پەیرەوی خوداش بە ڕووح ئەوەیە ، کە هەروەك چۆن جەستەی مرۆڤ بەبێ ڕووح ناژی و بۆگەنیو دەبێ ، مرۆڤیش - تاك و کۆمەڵ - بەبێ بەرنامەی خوا وەك جەستەی بێ گیان دەکەوێتە گۆڕێ و دەبێتە زبلدانی تێدا تروروکانی میکرۆبی سەدان جۆرە دەردو نەخۆشی و وەك درەختی کرمێ گەندەڵ دەبێ و دەڕزێ و ڕادەقەنێ .

بەڵێ هەبوونی گیان لە جەستەدا چەند گرنگ و پێویستە بۆ بەردەوام بوونی ژیان هەبوونی پەیامو پەیرەوی خوداش لەنێو تاك و کۆمەڵ دا هێندە مەرجە بۆ ڕاوەستان و بەڕێوە چوونی ژیانێکی ڕاست و ساغی مرۆڤانە .

جا ئێستا با بزانین دا خوا سەرجەمی ئەو درووشم و نیشانە و خەسڵەتە سەرەکی و بنچینەیی یانە کە ئایەتەکانی ( ٥٤،٥٥،٥٦ ) ی سوورەتی ( المائدة ) و ئایەتی ( ٢٢ ) ی سوورەتی ( المجادلة ) هەبوونیان بە مەرج دەگرن لە کەسانێك دا کە خۆیان بە کۆمەڵی خوا و بزووتنەوەی ئیسلامی لەقەڵەم دەدەن چین و چەندن :

یەکەم : بڕوا بوون بە خوا و بە ڕۆژی دوایی

**************************************

وەك لە ئایەتی (٢٢) ی ( المجادلة ) دا فەرمووی :( لا تجد قوماً یؤمنون بالله والیوم الآخر ٠٠٠٠٠) بەڵێ بڕوا بەخوا بوون و بڕوا بە دوا ڕۆژ بوون یەکەمین و گەورەترین و ٠٠ زەق ترین درووشم و نیشانەی کۆمەڵی خودایە ، چونکە بڕوا بەخوا بوون و بڕوا بە دوا ڕۆژ بوون، وەك دوو جەمسەر وان کە جم و جووڵ و کردەوەکانی ئینسان ڕێك دەخەن و هاو - سەنگی دەکەن و نایەڵن بەملاولایان دا بێت و بچێت و لەسەر ڕاستە شەقامی بترازێ ، بڕوا بەخوا بوون - بەشێوەیەکی ڕاست و ساغ - وا لە مرۆڤ دەکات کە بێجگە لە خوا رووی دلی نەکاتە هیچ قیبلەیەکی دیکەو ، بێجگە لە خوا پشت بە کەسی دیکە نەبەستێ و جگە لە خوا لە کەس نەپاڕێتەوەو ، بۆ خوا نەبێ سەر نەوی نەکا و لەوی نەبێ لەکەس نەترسێ و بۆ وی نەبێ خۆی ماندوو نەکا و لە پێناوی وی دا نەبێ نەژی و نەمری و ٠٠٠هتد ٠ وە بڕوا بە دوا ڕۆژ بوون وا لە مرۆڤ دەکات کە هەموو دەمێ هەست بە چاودێری خوا و فریشتەکانی بکات و دایم و دەرەم لێپرسینەوەی دوا ڕۆژی بەر دادگای خوای لەبەر چاو بێ و ، کەسێکیش وابێ خەتێ خوا ناکات و سنوور ناپەڕێنێ ٠

## دووەم : خوا خۆشی‌دەوێن و خوایان خۆش دەوێ

************************************************

وەك لە ئایەتی (٥٤) ی (المائدة) دا فەرموێ (یحبهم ویحبونه ...)

جا لەڕاستی دا ئەم خەسلەت و نیشانەیە ئەنجام و بەرهەمی حەتمی و سروشتیی خەسڵەتی پێشوویە چونکە بڕوا بەخوابوون و پەیمان و بەڵێنی بەندایەتی لەگەڵ خوا بەستن هەم دەبێتە هۆی ئەوەی کە خوا بەندەی خۆش بوێ وەك دەفەرموێ :(ان الذین آمنوا وعملوا الصالحات سیجعل لهم الرحمن وداً ...) مریم - ٩٦ .

بێگومان ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کرداری چاك دەکەن خودا - لە لایەن خۆیەوەو لەمە دڵی بەندەکانی دا - خۆشەویستی یان بۆ ساز دەکات.وە هەم دەشبێتە هۆی ئەوەی کە بەندەکان خوایان خۆش بوێ وەك دەفەرموێ :(( والذین آمنوا اشد حباً لله .....)) البقرة - ١٦٥ . وە ئەوانەی بڕوایان هێناوە - لە هەموو کەس - زیاتر خۆشەویستی - یان بۆخوا هەیە . چونکە خودا - سبحانه وتعالی - خاوەنی هەموو سیفەتێکی بەرزو پەسندەو سەرچاوەی هەموو چاکەو بەخششێکەو هەرکەسێك بیناسێ سیفەت پەسندی و چاکەکاری خودا ناچاری دەکات پڕبەدڵ خۆشی بوێ .

سێیەم : نەرمو نیانی و میهرەبانی بەرانبەر بڕواداران
************************************

وەك لە ئایەتی (٥٤) ی (المائدة) دا فەرموویەتی : (أذلة على المؤمنين ..)

جا لە ڕاستی دا ئەم خەسلەتەش ئەنجامو بەرهەمی سروشتی و چاوەڕوان کراوی .... خەسلەتی پێشوویە ، چونکە کەسێك بەڕاستی بۆ خوا ساغو یەکلا بوویێتەوەو دڵی پڕ بووبێ لە سامو ڕێزو خۆشەویستی خودا ، حەتمەن ئەو کەسانەشی خۆش دەوێن کە دۆستی خودان و خوا خۆشی دەوێن و خوایان خۆش دەوێ ، مرۆڤیش کە کەسێکی خۆشویست حەتمەن لە گەڵی سینگ فراوان و میهرەبان و نەرم دەبێ ، ئاخر چۆن خۆشی نەوێن ! ئەدی ڕێبواری یەك ڕێ و عەودالی یەك ئامانج و مەبەست و بەندەی یەك خواو شوێن کەوتووی یەك ڕابەر نین !!!

هەر بۆیەش خوای زانا کە باسی برادەرە بەڕێزەکانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەکات ـ خوا لێیان ڕازی بێ ـ دەفەرموێ : ( رحماء بينهم ) الفتح ـ ٢٩ . لەنێو خۆیان دا میهرەبان و بە بەزەیی و سۆزن .

چوارەم : ڕەقی و توندو تیژی لە ئاقار کافران دا
************************************

وەك لە ئایەتی (٥٤) ی (المائدة) دا فەرموویەتی : ( أعزة على الكافرين ...)

هەڵبەتە ئەم خەسڵەتمش ئەنجا مێكی چاوەڕوان كراوی خەسڵەتی دووەم و سێ یەمە . چونكە كەسێك كەسێكی خۆش ویست، هەروەك چۆن دۆست و خۆشەویستانی ئەو كەسەی خۆش دەوێن، دوژمن و ناحەزانیشی دەبوغزێنی، كەسێكیش كەسێك ببوغزێنێ و ڕقی لێی بێ، دیارە بەرانبەری ڕەق و توندو تیژ دەبێ . ئێنجا ئاشكراشە كە كافرو خوا نەناسان هەم دوژمن و ناحەزی خوا و پێغەمبەرو صلی اللە علیە وسلم هەم دوژمن و ناحەزی بڕواداراانیشن .

بەڵێ هەمان دڵ كە دۆستانی خودان پێ خۆش دەوێن ، دەبێ دوژمنانی خوداشی پێ ببوغزێنی دەنا جاری بڕوات كاڵ و كرچەو كامڵ نەبووە، وەك پێغەمبەری ڕابەرمان صلی اللە علیە وسلم فەرموویەتی : ( من أحب للە وأبغض للە ....فقد استكمل الأیمان ) رواه ابوداوود . واتە : هەر كەسێك لەبەر خوا ـ خەڵكی بڕواداری ـ خۆش بوێ و لەبەر خوا ـ خەڵكی نامسوڵمانی ـ ناخۆش بوێ و ببوغزێنێ ........ ئەوە بێ شك بڕوای تەواوو كاملە .

وە خوداش لە وەسفی برادەرە هەڵبژاردەكانی پێغەمبەردا ـ خوا لێیان ڕازی بێ ـ كە نموونەی ڕاستەقینەی بڕواداری تەواوو مسوڵمانی كامڵ بوون فەرموویەتی : (( أشداء علی الكفار )) الفتح ـ ٢٩ . لەسەر كافران توندو تیژن .

دیسان خودا فەرمان بە پێغەمبەرەکەی دەکات صلی الله علیه وسلم (( یا أیها النبی جاهد الکفار والمنافقین واغلظ علیهم ..... ) التوبە - ٧٣ .

ئەی پێغەمبەر لەگەڵ کافرو دەغەڵەکان دا بجەنگەو ڕەقی یان بەرانبەر بنوێنە .

وە فەرمان بە ئێمەی بڕواداریش دەکات :(( یا أیها الذین آمنوا قاتلوا الذین یلونکم من الکفار ولیجدوا فیکم غلظة واعلموا ان الله مع المتقین ) التوبە - ١٢٣ .

ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە لەگەڵ ئەو کافرانەدا بجەنگن کە لێتان نیزیکن وەبا ڕەقی - زەبری توند - تان تێدا ببینن ، وە بزانن کە خودا لەگەڵ پارێزکاران دایە .

( کەواتە وا گومان مەبەن کە ڕەقی و توندو تیژی نواندن و بێ ڕەحم بوون بەرانبەر ناحەزو دوژمنانی ڕێ ی خودا ، سیفەتێکی لەگەڵ ئیسلامدا نەگونجاوە !!

بەڵکو بە پێچەوانەوە ڕەقی و توندی و زەبر وەشاندن و بێ ڕەحمی سەبارەت بە کافرو لاڕێ و ناحەزانی خواو خەڵک بەشێکە لە بەشەکانی تەقواو پارێزو مەرجێکە بۆ هاتنەدی تەقواو پارێز لە بابای خواناسدا .)

پێنجەم : تێکۆشان و ڕەنج دان لە ڕێ ی خوادا

******************************

وەك لە ئایەتی (٥٤) ی ( المائدة ) دا فەرموویەتی :( یجاهدون فی سبیل الله ..)

ئەم خەسلەتەش وەك هاوەڵانی پێشووی ئەنجام و بەرهەمی خەسلەتەكانی پێش خۆیەتی ، چونكە كەسێك بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەبێ و ، خۆشەویستی خوا بێ و خوا خۆشی بوێ و ، دۆستانی خوای خۆش بوێ و لەگەڵیان نەرم و میهرەبان بێ و ، ڕقی لە ناحەزو دوژمنانی خوا بێ و بەرانبەریان ڕەق و توند بێ ، دیارە هەوڵی بەرزكردنەوەی ئالای بەرنامەی خوا و ، نەوی كردنی ئالای پەیڕەوو ڕژێمی ناحەزانی و وەسەرخستنی دۆستانی و زەبوون كردنی دوژمنانی دەدات و ، لەو ڕێ یەدا ئەرك دەكێشێ و ڕەنج دەداتە

بەڵێ كورد گوتەنی :(( تیغی ڕەسەن خۆی لە كالانێ دا ڕاناگرێ )) و كەسێكی بڕوا - داری ڕاستەقینە بێ و خۆشەویستی خواو پێغەمبەرەكەی و صلی الله علیه وسلم دۆستانیان و ، بوغزی دوژمن و ناحەزانی خواو پێغەمبەرو بڕواداریان لە دڵ دا بێ خۆ وەخۆ ناگرێ دانیشێ و چاو لە واقیعی لەگەڵ ئیسلامدا نەگونجاوەوە زەق بكات یان ببێتە تەماشاچی و سەیركەری جەنگی نێوان بەرەی خواو بەرەی شەیتان •

هەر بۆیەش پێغەمبەری دانا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی : ( من اصبح لا یهتم للمسلمین فلیس منهم ) اخرجه الطبرانی و ابو نعیم واتە :
هەر كەسێك بە تەنگ كاروباری مسوڵمانانەوە نەبێ و مشووریان لێ نەخوات ئەوە لەوان نیە •

شەشەم : بێ باکی لە تانەو تەشەری سەرکۆنە کەران
***************************************

وەك لە ئایەتی (٥٤) ی (المائدة) دا فەرموویەتی :( و لا یخافون لومە لائم ..)

ئەم خەسڵەتەش دیسان ئاڵقەیەکە لە زنجیرەی ئاڵقەکانی دیکەو ئەنجامێکی عەقڵی و سروشتی خەسڵەتەکانی پێشوویە .

چونکە کەسێك خوای پڕ بەدڵ خۆش بوێ و دۆستی میهرەبانی بڕواداران و دوژمنی بێ ئامانی کافران بێ و لەسەر خواو دۆستانی وەدەنگ بێ ، لەگەڵ ناحەزانی خواوە.. خەڵك دا سەرگەرمی تێکۆشان و جەنگ بێ ، دیارە گوێ نادا تە حەپە حەپی سەگوەڕی لاڕێ و توانج و پلارو لۆمەو سەرکۆنەو قسەو قسەڵۆك و پڕوپاگەندەی بێ جێ ی دوژمنانی فێڵبازو زۆر زان و دۆستانی فەقیر حاڵ و بەستەزمان و نەزان !!

حەوتەم : پشت بەستن بە خواو پێغەمبەرو صلی الله علیه وسلم بڕواداران
*****************************************************

وەك لە ئایەتی (٥٥) ی (المائدة) فەرموویەتی :(إنما ولیکم الله ورسوله والذین آمنوا ...)

بەڵێ تاقە پاڵپشت و پشتیوانی کۆمەڵی خوا ( حزب الله ) و تاقە دۆســـــت و

یاریدەدەرێك كە جێی پشت ئەستووری و متمانەو دڵنیایی و ئومێدی كۆمەڵی خواو ......

بزووتنەوەی ئیسلامی بێ خواو پێغەمبەرەكەی و صلی الله علیه وسلم بڕواداران .

خودا ( جل جلالە ) لەبەر ئەوەی مردن و ژیان و قازانج و زیان و وردو درشتی بوونە - وەری لەبەر دەست دایەو هەموو شتێكی خستۆتە ژێر ركێفی دەستەڵاتی خۆیەوەو بەبێ ویستی وی هیچ شتێك نایەتەدی و دار لەسەر بەردی دانانرێ و مێش لە ئاو ناكرێ !!

وە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە سۆنگەی ئەوەوە كە تەواوترین و چاكترین نموونەی كردەیی و واقیعی و زیندووی ئیسلامەو رێ و شوێنەكەی تاك و كۆمەڵ لە هەموو جۆرە سەرگەردانی و رێ لێ تێكچوونێك دەپارێزێ . (١)

وە بڕواداران چونكە تاقەكانی و سەرچاوەی تین و وزەی كۆمەڵی خودان و كۆمەڵی خواو بزووتنەوەی ئیسلامی جگە لەوان كەسی دیكە شك نابات كە لێی دڵنیا بێ و مسۆگەر بێ كە فێڵی لێ ناكاو لە ناسكترین و دژوارترین كاتدا پشتی لەزەوی نادات !!

---

(١) واتە كە دەڵێین پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پشت و پەناو یاریدەدەری كۆمەڵی خودایە مەبەستمان ئەوەیە كە بە هۆی هەڵگرتنی شوێن پێی وی و پابەندی رێ و شوێنەكەی سەركەوتوو و سەرفراز دەبێ دەنا پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم هەر بەندەی خوایەو ..هتد .

بەڵێ کۆمەڵی خوا بێجگە لە خوا و پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم و بڕوادارن بۆی نیە لەگەڵ هێزو بەرەو تاقمێکی دیکەدا دۆستایەتی و خۆشەویستی یەك بەرپا بکات کە بیکاتە جێی متمانەو پشت ئەستووری و دڵنیایی خۆی، وەك لە ئایەتی (٢٢) ..... (المجادله) دا فەرموویەتی: (لا تجد قوما یومنون بالله والیوم الاخر یوادون من حاد الله ورسوله ولو کانوا ... الخ)

چونکە بابای بڕوادارو مسوڵمان، خوا و پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم لەهەموو شتێك خۆشتر دەوێن و هەرکەسێك لەگەڵ وان دا دانووی نەکوڵێ و بە بەرنامەکەیان رازی نەبێ و جەنگیان لەگەڵ بکات، ئەوە ئاشکرایە کە بابای مسوڵمان وکۆمەڵی بڕوادار چاریان ناچارە دەبێ نێوانی لەگەڵ تێك بدەن و جەنگی لەگەڵ دا بکەن.

جا لێرەدا رەنگە پرسیارێك لە دەلاقەو پەنجەرەی زۆر دڵان سەرەتاتکە بکات: باشە مادام وایە ئەدی بۆچی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەگەڵ جوولەکانی دەورووبەری و هەندێك لە تیرەو هۆزە کافرو بت پەرستەکان دا پەیمانی دوستایەتی بەستبوو؟ وە بۆچی ئێستاش دەبینین بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستان داو لە زۆر جێی دیکەش دا، بەڵێن و پەیمانی دۆستایەتی و هاوکاری لەگەڵ ئەو تاقم و پێرانەدا بەستوە کە بەرنامەو پەیرەوەکانیان غەیری ئیسلامن؟!!

له وه‌لامی ئه‌و پرسیاره‌دا ده‌لێین :

خوای زاناو کاربه‌جێ فه‌رموویه‌تی :(( لا ینهاکم الله عن الذین لم یقاتلوکم فی الدین ولم یخرجوکم من دیارکم ان تبروهم وتقسطوا الیهم ان الله یحب المقسطین . )) الممتحنة - ٨ . واته :

خودا سه‌باره‌ت به‌وانه‌ی که له‌سه‌ر ئایین - له‌به‌ر ئه‌وه‌ی مسولمانن - جه‌نگیان له‌گه‌لتان نه‌کردوه‌و له خانوو و به‌ره‌تان وه‌ده‌ریان نه‌ناون، رێتان لێ ناگرێ که چاکه‌یان له‌گه‌ڵ بکه‌ن و له‌گه‌لیان دادگه‌ربن، به‌راستی خوا دادگه‌رانی خۆش ده‌وێن .

به‌لێ پێغه‌مبه‌ر صلی الله علیه وسلم بۆیه په‌یوه‌ندی دۆستانه‌و هاوکاری یانه‌ی له‌گه‌ڵ جووله‌که‌کانی ده‌وروبه‌ری و هه‌ندێک له تیره‌و هۆزه هاوبه‌ش په‌یداکه‌ر ( مشرک ) - ه‌کان دا هه‌بوو، چونکه ئه‌وانه دژی پێغه‌مبه‌رو مسولمانان نه‌بوون (١) یان وایان پیشان ده‌دا که دژ نین ! وه بزووتنه‌وه‌ی ئیسلامیش به‌هه‌مان شێوه هه‌ر پێرو تاقمێک دژی نه‌بێ و په‌رچی نه‌یه‌نێته رێ و له‌گه‌لی نه‌جه‌نگێ، هه‌رچه‌نده شوێن که‌وتووی

---

(١) به‌لام دوای ئه‌وه‌ی په‌یمان و به‌لێنیان شکاندو دژایه‌تی یان کرد پێغه‌مبه‌ریش صلی الله علیه وسلم بریاری جه‌نگی له‌گه‌ڵ دان و به‌سێنایی بنه‌بری کردن .

غەیری ئیسلامیش بێ بۆی نیە لەخۆوە تێ ی هەڵپێچێ و لەگەڵی دەستەویەخە بێ چونکە نە تۆبزی کردن هەیە لە وەرگرتنی ئایین دا (( لا اكراه فی الدین .. )) البقرە- ٢٥٦ . وە نە پێغەمبەرو پێشەوایەکەشی صلی اللە علیە وسلم کارێکی وای کردوە تا ئەویش چاوی لێ بکات .

ئنجا سەرەڕای ئەوەش ئەمڕۆ لە کوردستانی عیراق دا ئێمەو ئەو پیرو تاقمانە .... هاوسەنگەرو هاوئامانجین و، ئامانج و مەبەستی ئێمەو ئەوانیش ئەوەیە کە خەڵکی ژێرچەپۆك و بەشخوراوو ستەمدیدەی کوردی موسوڵمان، لەژێر نیری رژێمی طاغووتی بەعس بێنینە دەرێ و ڕژێمی ناوبراو بەرەو زبڵدانی مێژوو ڕەوان بکەین و، بارودۆخێك فەراهەم بێنین کە دادگەری و ئازادی و یەکسانی تێدا بچەسپێ .

جا هەرچی ئێمەین لە سەدا سەد بڕوامان وایە کە ئەو ئامانج و مەبەستە لەڕێ ی ئیسلامەوە نەبێ هاتنەدی مەحاڵەو، ئەوانیش هەریەکەیان پەیرەوو بیردۆزەیەکی پەسند کردوە کە پێ ی وایە دەیگەیەنێتە ئامانجی ناوبراو .

کەواتە ئێمەو ئەوانیش هیچ لایەکمان پەکمان لەسەر دژایەتی کردنی یەکدی نەکەوتوەو حەوجێ ی هیچ جۆرە ناکۆکی و دووبەرەکی یەك نین، وە هەر جۆرە لێك خوێندن و ... هەرا نانەوەو دووبەرەکی دروست کردنێك بە (( شەڕی دەوەن بە ئاش )) لەقەڵەم دەدرێ و

به زیانی خۆمان و گەلە چەوساوەکەمان تەواو دەبێ .

## هەشتەم : نوێژ کردن و زەکات دان

******************************

وەك لە ئایەتی (٥٥) ی ( المائدة ) دەفەرموێ : ( الذين يقيمون الصلاة ويؤتون الزكوة وهم راكعون )

بەڵێ نوێژو زەکاتیش دوو درووشم و نیشانەی هەرە بندڕەتی و زەقی کۆمەڵی خودان و هەر کامێکیان چاکترین جوێ کەرەوەی کۆمەڵی خوایە لە غەیری خۆی .

جا هەرچی نوێژە جۆرو چۆنیەتی پەیوەندی مرۆڤی مسوڵمان و کۆمەڵی مسوڵمان لەگەڵ خوادا ڕوون دەکاتەوە ، نوێژ ڕازو نیازی بەندانەی قووڵ و بەکوڵ و پەیمان و بەڵێن نوێ کردنەوەو ، ئەوپەڕی گچکەیی و بەندەیی نواندن و [illegible] بە پاك گرتن و بە گەورەگرتن و سوپاس کردن و ڕێزو حورمەت گرتنی مرۆڤی مسوڵمانە سەبارەت بە خودا سبحانەوتعالی .

وە هەرچی زەکاتیشە جۆرو چۆنیەتی پەیوەندی مرۆڤی مسوڵمان بە مسوڵمانانەوەو کۆمەڵی مسوڵمان لەنێو خۆی دا دەخاتە ڕوو ، ئیسلام بە پێچەوانەی ڕژێمی سەرمایە ـ داری یەوە کۆمەڵ ناکاتە بەلاگێڕی تاك و مەردای تاك ( فرد ) نادات هەموو سنووورو

شیرازەیەکی ئینسانەتی و ویژدان و ڕەوشت بشکێنێ و بچڕێنێ و ببێتە سەگێکی هارو
لە بەلەکی کۆمەڵی بەردات، وە بە پێچەوانەی ڕژێمی کۆمونیزمی و سۆشیالیزمەوە تاکیش
لەژێر پێی کۆمەڵ دا ناپلیشێنێتەوەو نایکاتە قوربانی و نایەلێ بارودۆخێکی وا ....
بەرخسێ تاک ببێتە جەرو بورغویێکی بێ ئیرادەو دەستەپاچە لە ئامێری کۆمەڵ دا، چونکە
کۆمەڵیش هەر لە چەند تاکێك پێك دێ و کۆمەڵێك تاکەکانی ئازادو سەربەخۆ و خاوەنی
بڕیارو ویستی خۆ نەبن، کۆمەڵێکی کۆیلەو دیل و ژێر چەپۆکە .

بەلێ پاراستنی هاوسەنگی لەنێوان بەرژەوەندی کۆمەڵ و ئازادی تاك دا، یەکێکە لــە
نیشانە جیاکەرەوەکانی ئیسلام لە غەیری خۆی، جا زەکات کاریگەرترین دەوری هەیە لە
پەیدا کردنی ئەو هاوسەنگی یەدا، چونکە زەکات لە لایەکەوە جۆری پەیوەندی تاك بــە
کۆمەلەوە ڕوون دەکاتەوە، کە بریتیە لە میهرەبانی و هاوکاری و لەخۆ بوردوویی، وە لە
لایەکی دیکەشەوە جۆرو چۆنیەتی ئازادی تاك دەخاتەڕوو، کە بریتیە لە ئازادی یەکــی
سنووردارو مەرج دار، واتە تاك هەر تا ئەو ئەندازەیە ئازادە تا چالاکی یەکانی - جا
فیکری بن، سیاسی بن، کۆمەلایەتی بن، ئابووری بن ..هتد - لەخزمەت کۆمەڵ دان و زیان
بە بەرژەوەندی گشتی ( المصلحة العامه ) ناگەیەنن، دەنا لێرە بەولاوە توند دەستی
دەگیرێ و ئەو ئازادی یەی کە بە هەلەو ناهەق بەکاری دێنێ لێی زەوت دەکرێ .

پوختەی قسان ئەوەیە کە نوێژ دروشمو نیشانەیەکە لەسەر خواپەرستی ی کۆمەڵی خودا و ، جۆرو چۆنیەتی پەیوەندی لەگەڵ خوادا ، وە زەکات دروشمو نیشانەی خەڵکی دۆستی و جۆرو چۆنیەتی پەیوەندی کۆمەڵی خوایە لەگەڵ خۆی و لەنێوخۆی دا ، کەواتە دەتوانین بڵێین یەکی دیکە لە خەسڵەتەکانی کۆمەڵی خودا ئەوەیە کە خواپەرست و خەڵک دۆستە .

## نۆیەم : سەرکەوتن و سەرفرازی

**************************

وەك لە ئایەتی (٥٦) ی ( المائدة ) دا فەرموویەتی :( ...فان حزب الله هم الغالبون )

وە لە ئایەتی (٢٢) ی ( المجادلة ) دا فەرموویەتی :( الا إن حزب الله هم المفلحون)

بەڵێ سەرکەوتن و بەمراد گەیشتن و سەرفرازی یەکی دیکەیە لە خەسڵەتە بەرزو بنەڕەتیەکانی کۆمەڵی خودا ، چونکە بوونەوەر تێکڕا لەژێر چاوەدێری خوداو ڕکێفی ویستو دەسەلاتی خوادا بەڕێوە دەچێ و ، هێزو دەسەلات هەمووی ئی خودا بەو قازانج و زیان و مردن و ژیان بەس لەدەست وی دایە ، جا بێگومان کۆمەڵێك سەر بە خودا یەکی هێندە بەرزو مەزن بێ ، دیارە سەرکەوتن و بەختەوەری و سەربەرزی هەر لەگەرەوی وی دایە ، وەك دەفەرمووێ :

(( ولقد سبقت كلمتنا لعبادنا المرسلين . انهم لهم المنصورون . وان جندنا لهم الغالبون . )) الصافات - ١٧١ ١٧٢ ١٧٣ . واته :

وە بێگومان بڕیاری ئێمە بۆ بەندە ڕەوانەکراوەکانمان ڕابردوە ، کە هەر ئەوان .... سەرکەوتوون ، وە بێگومان بەس سەربازەکانمان زاڵن .

دیسان فەرموویەتی :(( انا لننصر رسلنا والذين آمنوا في الحيوة الدنيا و يوم يقوم الاشهاد . )) المؤمن - ٥١ . واته :

بەڕاستی ئێمە پێغەمبەرانمان و ئەوانەی بڕوایان هێناوە ، لە ژیانی دنیادا و لەو ڕۆژەی دا کە شایەد ڕاست دەبنەوە - واتە ڕۆژی دوایی - وەسەردەخەین .

جا ئەوەی ڕاستی بێ واقیعی مێژووش هەتا ئێستا هەموو ڕووداوەکانی بێ هێچ و پەنا پشتگیری ئەم ڕاستی یە قورئانی یە دەکەن و ، لە هەر کات و جێ یەک دا کۆمەڵی خوا ( حزب الله ) - بەلام بە مەرجێک بەڕاستی و وەک خوا و پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویانە کۆمەڵی خودا بووبێ - لە ڕاست هەر هێزو تاقمێکدا هاتبێ پشتی لە عەرزی داوە و لە خۆڵی ی وەرداوە ، کێ دەڵێ کوا ؟! با سەرنجی مێژوو بدا !!

## دەیەم : گەیشتن بە بەهەشت و ڕەزامەندی خوا

************************************************

وەک لە ئایەتی (٢٢) ی ( المجادلة ) دا فەرموویەتی : ( ...ويدخلهم جنات تجري من تحتها الأنهار خالدين فيها رضيَ الله عنهم ورضوا عنه ... ) .

هەڵبەتە ئەم خەسڵەتەش کە دوایین خەسڵەت و نیشانەی بنەڕەتی کۆمەڵی خودایە ئەنجام و بەرهەمی سروشتی و ئاسایی خەسڵەت و نیشانەکانی پێش خۆیەتی و کۆمەڵێک ئەو (٩) خەسڵەتەی پێشوویان تێدا بێ، خوای کاربەجێ و میهرەبان و دادگەر وەک خەڵات و پاداشتێک ئەم خەسڵەتی دەیەمەشیان بەقسمەت دەکات و، دەیانباتە نێو ئەو باخ و باغات و کۆشک و تەلارە ڕازاوە و نەبڕاوانەوە کە بۆی ئامادە کردوون وەلە ڕەزامەندی خۆی بەشیان دەدات و، بەدیداری پاکی خۆی و پێغەمبەری خۆشەویست و بەندە پەسندو هەڵبژاردەکانیان شاد دەکات . خوا بە لوتف و بەخششی خۆی بمانگێڕی لەو جۆرە کەسانەو، بمانباتە سەر ڕێ و شوێنی بەرزو پیرۆزیان .

ئامین .

خوێنەری خۆشەویست !

ئێستا کە تا ڕادەیەك لەبەرتیشکی قورئانی بەڕێزدا سەروسیما و خەسڵەت و.. نیشانە سەرەکی و بنەڕەتییەکانی کۆمەڵی خوا ( حزب اللە ) مان خستەڕوو با بچینە سەر سەرچاوەی دووەمی ئیسلام و لە باخی لالەزاری سوننەتی پێغەمبەری سەردار صلی علیە وسلم چەند گوڵێك بچنین و بزانین پێشەوا و سەروەرمان چۆن باسی کۆمەڵی خودا دەکات !

بەڵام پێشەکی پێویستە ڕاستی یەك هەیە لێی بێ ئاگا نەبین :
وشەی کۆمەڵی خوا ( حزب اللە ) بە دوو چەمك بەکاردێ، یەکیان گشتی و ئەوی دیکەیان تایبەتی، چونکە موسڵمانان بەگشتی چاك و خراپ بە کۆمەڵی خودا لەقەڵەم دەدرێن بەڵام بێگومان مەرج و خەسڵەتەکانی کۆمەڵی خودا هەموویان لە هەموو موسڵمانێك دا نایەنە دی، بۆیە ناچارین بڵێین : وشەی ناوبراو جگە لەو چەمك و واتا گشتی یە چەمك و واتایەکی دیکەی تایبەتیشی هەیە، کە بریتیە لە کۆمەڵێکی هەڵبژاردەو پوختەو کامڵ لە ئوممەتی ئیسلامی و کۆمەڵی موسڵمانان .

جا ئێمە ئێستا کۆمەڵە فەرموودەیەك دێنینەوە کە هەندێکیان پەیوەندی یان بە چەمك و مەبەستی گشتی و فراوانی وشەی "کۆمەڵی خوا" وە هەیە وە هەندێکیشیان پەیوەندی یان بە چەمك و واتای تایبەتی وشەی ناوبراوەوە هەیە .

## یەكەم : كۆمەڵی خوا یەكریزو پێكەوە جۆشدراوە :

وەك پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ :(( المؤمن للمؤمن كالبنيان يشد بعضه بعضاً )) متفق عليه . واتە :

بڕوادار بۆ بڕوادار وەك - چینی - دیوار وایە هەندێكی هەندێكی ڕادەگرێ و بەهێز دەكات .

## دووەم : كۆمەڵی خوا یەكدڵن و هەست بە ئێش و ژانی یەكدی دەكەن :

وەك پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی :(( مثل المؤمنين في توادهم وتراحمهم وتعاطفهم مثل الجسد الواحد اذا اشتكى منه عضو تداعى له سائر الجَسدِ بالسَهَر والحُمّى )) رواه مسلم واحمد .

واتە : وێنەی بڕواداران لە یەكدی خۆشویستنیان و بەزەیی بەیەكدا هاتنەوەیان و بەرانبەر یەك میهرەبان بوونیان داوەك جەستەیەك وایە كە ئەگەر ئەندامێكی ئازاری هەبێ تێكڕای - ئەندامەكانی - جەستە لێی دەگێڕنەوەو بە شەونخوونی و گرانەتا بەشداری دەكەن .

بسان فەرموویەتی :( المؤمن مِرآةَ المؤمن ...) رواه ابوداوود والبخاری فی
( الادب المفرد ) واته :

بروادار ئاوێنەی بروادارە، یانی هەڵەکانی بۆ ڕاست دەکاتەوەو تاتەواوی یەکێ
پێ دەڵێ .

سێیەم : کۆمەڵی خوا هێدی و نەرم و نیانن
*****************************************

وەك پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی :(( المؤمنون هَیِّنون لَیِّنون...))
راه البیهقی . واته :

برواداران هێدی و نەرمن . بەڵێ ئارامی و ویقارو سەنگینی، خەسڵەتێکی بنەڕەتی
کۆمەڵی خوایە، چونکە بابای دل بەخواوە بەستراو، کەم و زۆر تیشکی سیفەتە بەرزو
پیرۆزەکانی خودای تێدا دەدرەوشێتەوە، هەوڵ دەدات ئەو خەسڵەتە بەرزو پەسند
- انەی خودا، کە لە مرۆڤ دەوەشێنەوە، لەخۆیان دا بینێتەدی .

گومانیشی تێدا نیە، کە ئارامی و پەلەنەکردن و نەرمیش یەکێکە لە خەسڵەتە بەرزو
پەسندەکانی خوا - جل جلاله - (( انه کان حلیماً غفوراً )) الاسراء - ٤٤ .

بەلام ئاگاشمان لەوە نەبێ کە بابای مسولمان کارامەو لێزانەو هەرشتە لە

جێ ی شیاوی خۆی دا دادەنێ و ، هەرچەندە نەرمی و هێدی و هێواشی خەسڵەتێکی بنچینەیی یەتی ، بەڵام لە کاتێك دا توندو تیژی و ڕەقی نواندن پێویست بێ بەکاری ... دێنێ ، وەك خودا لە وەسفی برادەرە بەڕێزەکانی پێغەمبەردا خوا لێیان رازی بێ دەفەرموێ :(( اشداء علی الکفار رحماء بینهم ) الفتح - ۲۹ .

چوارەم : کۆمەڵی خوا زیرەو وریا و چوست و چالاکن

**************************************************

وەك پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی :( المؤمن کیّس فَطِنٌ حَذِرٌ) اخرجه الدیلمی . واتە : بڕوادار عاقڵ و بیرتیژو دوور بینە .

هەروەها فەرموویەتی :( (( لا یلدغ المؤمن من جحر واحد مرتین . )) متفق علیه . واتە : بڕوادار دوو جاران لە کونێکەوە پێیەوە نادرێ .

پێنجەم : کۆمەڵی خوا هەرچی لەگەڵیان تێکەڵ بێ لێیان بەهرەمەند دەبێ

**************************************************

وەك پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی :( مثل المؤمن مثل العطّار ان جالسته نفعك وان ماشیته نفعك وان شارکته نفعك ) اخرجه الطبرانی .

واتە بڕوادار وەك عەترفرۆش وایە ، لەگەڵی دانیشی هەر سوودت پێ دەگەیەنێ ،

لەگەڵی بەڕێیەدا بڕوێ هەر سودت پێ دەگەیەنێ، وە ـ لە شتێك دا ـ ببیە هاوبەشی
هەر سودت پێ دەگەیەنێ .

## شەشەم : کۆمەڵی خوا دەست و زمان پاکن

****************************************************

وەك پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم فەرموویەتی : ( المؤمن من أمنه الناس علی اموالهم وانفسهم ... ) رواه ابن ماجه . واتە :

بڕوادار ئەوەیە کە خەڵك لە لایەن ویەوە لە ماڵ و گیانیان دڵنیا بن .

وە فەرموویەتی : ( المسلم مَنْ سَلِمَ المسلمون من لِسانِه ویَدِهِ ) رواه الترمذی والنسائی و احمد . واتە :

مسوڵمان کەسێکە کە مسوڵمانان لە دەست و زمانی سەلامەت بن .

دیسان فەرموویەتی : ( لیس المؤمن بالطعان ولا اللعان ولا الفاحش ولا البذیء ) رواه احمد والترمذی والبخاری فی الادب المفرد .

واتە : بڕوادار نە بە توانج و پلارەو نە نەفرین کەرەو نە جنێوفرۆشەو نە زمان شڕە، چونکە دڵ و زمان مەنجەڵ و کەوچکن، و دڵ و دەروونی بابای بڕواداریش دایمە لەژێر چاودێری دایەو، نایەڵێ ببێتە کانگەی شتی پیس، تا لە ڕێی کەوچکی زمانەوە بێتە دەرێ .

حەوتەم : کۆمەڵی خوا هەموو ئەندامەکانی هەست بە بەرپرسیاری دەکەن

************************************************************

وەك پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ :( من أصبح لا یهتم للمسلمین فلیس منهم )) اخرجه الطبرانی وابونعیم .

واتە : هەرکەسێك بەتەنگ مسوڵمانانەوە نەبێ ئەوە لەوان نیە !!

وە لە فەرموودەیەکی دیکەدا دەفەرموێ :(( کلکم راع وکلکم مسئول عن رعیته )) رواه احمد والشیخان . واتە :

هەرکامێکتان شوانەو لەئاقار کۆمەڵەکەی دا بەرپرسیارە .

جا خوێنەری سەنگین !

ئەگەر ئێمە بمانەوێ تەواوی ئەو خەسڵەت و دروشم و نیشانانەی کۆمەڵی خوا بنووسین کە پێغەمبەری رابەرمان صلی الله علیه وسلم لە فەرموودە بەرزو پەسندەکانی دا خستوونیە روو، ئەوە نەك بۆ چەند لاپەرەیەك بگرە بەچەند بەرگێکیش ئەو کارەمان بۆ ناکری، بەلام کورد گوتەنی :( لویچێك نموونەی تەغارێکە ))،( واللبیب بالاشارة یفهم )) .

بەلام ئەو (٧) خەسڵەتانەی باسمان کردن چەند خەسڵەتێکن کە وشەی کۆمەڵی

خوا ( حزب الله ) بە چەمك و واتا گشتی و فراوانەکەی دەیانگرێتەوە ؛ بەواتایەکی دی چەند خەسڵەتێکن مسوڵمانان بەگشتی تێیان دا بەشدارن . جا وەك گوتمان ... کۆمەڵی خوا جگە لە چەمك و واتا گشتی یەکەی چەمك و واتایەکی دیکەی تایبەتیشی هەیە کە بەس کۆمەڵە مسوڵمانێکی دانستەو هەڵبژاردەو کامڵ دەگرێتەوە .

جا وا ئێستاش چەند فەرموودەیەکی دیکەش دەخەینەڕوو کە باسی چەند خەسڵەتێکی دیکەی کۆمەڵی خوا ( حزب الله ) دەکەن ؛ کە بەس لەو کۆمەڵە مسوڵمانە هەڵبژاردەو دانستەیەدا هەن ؛ کە چەمك و واتای تایبەتی و ڕاستەقینەی (کۆمەڵی خوا ) دەیانگرێتەوە :

هەشتەم : کۆمەڵی خوا لە خەتی پێغەمبەرو برادەرانی لانادات

****************************************************

وەك پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی :(( ...وان بني اسرائیل فرقت علی ثنتین وسبعین ملة وتفترق امتي علی ثلاث وسبعین ملة کلهم فی النار الا ملە واحدە؛ ما انا علیه واصحابي ) رواه الترمذی عن ابن عمرو ؛ ( منتخب کنز العمال ) ج ١ ص ١٠٠ لەسەر پەراویزی ( مسند الامام احمد ) .

واتە : .. وە وەچەی ئیسرائیل دابردابر بوون و بوونە (٧٢) تاقم وە ئومەتی

منیش دابردابڕ دەبێ و دەبێتە (٧٣) دەستە ، هەموویان لە ئاگری - دۆزەخ - دان ....

بێجگە لە یەك كۆمەڵ - ئەوانیش ئەوانەن - كە لەسەر خەتی من و برادەرانمن .

لەم فەرموودەیەدا دەردەكەوێ كە لە ئوممەتی پێغەمبەرمان صلی الله علیه وسلم

تەنیا كۆمەڵێكی كەم ( $\frac{1}{73}$ ) ی !!! لەسەر خەت و ڕێ و شوێنی ئیسلامی

ڕەسەن ، ڕێ و شوێنی پێغەمبەرو برادەرانی - خوا لێیان ڕازی بێ - كە كۆمەڵی

ڕاستەقینەی خوا بوون ، دەمێننەوە دیارە ئەو كۆمەڵە كەمەش ( حزب الله ) ی تایبەتیو

ڕاستەقینەو سەرتۆپی مسوڵمانەتین .

نۆیەم : كۆمەڵی خوا ڕێ و شوێنی پێغەمبەر صلی الله علیه

وسلم دوای تێكدرانی دەبووژێننەوە

***************************************************************

وەك پێغەمبەری زانا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی : ( فان الدین بدأ غریباً

وسیعود غریباً كما بدأ فطوبى للغرباء وهم الذین یصلحون ما افسد الناس من

بعدي من سنتی ) رواه الترمذی .

واتە : جا بێگومان ئایین بە سەیری سەری هەڵداوە ، وە هەروەك چۆن بە سەیری

پەیدا بووە ، كە دەشگەڕێتەوە - بۆ مەیدانی ژیان - هەر بەسەیری دەگەڕێتەوە جا

خۆشی و بەختیاری بۆ غەریبان ، ئەوانیش ئەو کەسانەن / ئەوەی کە خەڵکی دوری ..
من لە ڕێ و شوێنی من تێکیان داوە چاکی دەکەنەوە .

بەڵێ یەکی دیکە لە خەسڵەتە بنەڕەتییەکانی کۆمەڵی خوا ، ئەوەیە کە چاک
کردنەوەو زیندوو کردنەوەی سوننەت و ڕێ و شوێنی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم
بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانێ و لەو ڕێیەدا هەرچی لە دەستی بێ دەیکاو
سەرو ماڵی بەخت دەکات .

جا بێگومان هەموو موسڵمانان بەگشتی بەم کارە هەڵناستن و گەلێکیان هەر
بە ئەرکی خۆشیانی نازانن و ڕەنگە بە نەزانی و بێئاگایی ـــ زۆریش ئەوانە
ببوغزێنن کە بە کارێکی وا هەڵدەستن ، کەواتە ئەو غەریبانە بریتین لەو کۆمەڵە
موسڵمانە پوختەو دانستەیەی کە ناوی ( حزب الله ) ی وەک پێویست لێ دەوەشێتەوەو
خوای زاناو کاربەجێ و میهرەبان دەنک دەنک هەڵیان دەبژێرێ هەریەکەی لە
شوێنێک و لە ناوچەیەک وە بەهۆی بڕواو خۆشەویستی خۆی و پێغەمبەرەکەیەوە
دڵیان پێکەوە گرێ دەدا و ، دەیانکاتە بەنکێک و دەیانکاتە هۆی نوێ بوونەوەو
گەشەکردنەوەی خەت و ڕێبازو ڕێ و شوێنی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم .

## دەیەم : کۆمەڵی خوا کۆمەڵێکی جەنگاوەرەو مایەی مانەوەی ئاینە

وەك پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی : ( لن يبرح هذا الدين قائما تقاتل عليه عصابة من المسلمين حتى تقوم الساعة ) رواه مسلم .

واتە : ئەم ئاینە هەر ڕاوەستاو دەبێ هەتا ڕۆژی دوایی کۆمەڵێك لە مسوڵمانان لە پێناوی دا دەجەنگن .

بەڵی ئەم ئاینە ئەم بەرنامە نێروتەواوە ئەم خەت و ڕاستە شەقامەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ، درەختێکە کاتی خۆی بۆ شین بوون و فرازووبوونی خوێن و ئارەق و شەونخونی و ئێشکەگرتن و دەربەدەری و برسیەتی و ڕووتی و تینووەتی و چی و چی بۆ خەرج کراوەو ، ئێستاش مانەوەی هەر بەوە دەبێ کە کۆمەڵێك خوانانسی کامڵ و تەواوو چاوساغ و جەرگداروو لێبڕاو هەبن ، هەچی لێی خواستن بۆی خەرج بکەن و ڕژدی لە هیچ شتێکیان دا نەکەن . جا بێگومان ئەم خەسڵەتەش بەگشتی لە مسوڵمانان دا نابینرێ و چەمك و واتای گشتی و بەرفراوانی وشەی ( حزب الله ) ناپگرێتەوەی ناچارین بڵێین : ئەم خەسڵەتەش یەکی دیکەیە لە خەسڵەت و درووشمە تایبەتی و سەربخۆیەکانی ئەو کۆمەڵە هەڵبژاردەو دانستەیەی وشەی [چەمکی] ( حزب الله ) پڕ بە پێستیەتی و خودا لە نێو کۆمەنی ئیسلامدا

نێو نێوە لەهەر چاخ و سەردەمێک دا ، هەڵیان دەبژێرێ و بە ڕاستی بەرنامە

کەی و بووژاندنەوەو چاککردنەوەی خەت و ڕێ و شوێنی پێغەمبەرەکەیان

پێ دەسپێرێ .

ئەلێرەش دا کۆتایی بە چنینی گوڵان دێنین لە باغی چرووپەو تەڕوپاراوو سەربەخێری فەرموودە گرانمایەکانی پێغەمبەرو صلی الله علیه وسلم . خوا یاریێ دەچینە سەرو کاری پێناسەیەکی کورت و پوختی ئەو ـ کۆمەڵی خوا ـ ( حزب الله ) و بزووتنەوە ئیسلامی یەی کە لەم سەردەمەدا بە لوتف و بەزەیی خودا لە کوردستان دا ...... ( کوردستانی بەشی عێراق ) پەیدا بووە .

جا بێگومان مادام ئێمە لەم ( ڕێ خۆشکردن ) ەدا تا ئەندازەیەک سەرو سیما و خەسلەت و نیشانەو درووشمە بنەڕەتی یەکانی ( کۆمەڵی خوا ) مان خستەروو لە پێناسە کردنی ( بزووتنەوەی ئیسلامی ) دا زۆر حەوجێی بە پێوەچوون و درێژ دادری نابین، چونکە ( بزووتنەوەی ئیسلامی ) ش ئەمڕۆ لە کوردستان دا خۆی بە نوێنەرو نموونەیەکی کردەیی و واقیعی ( کۆمەڵی خوا ) لەنەلەم دەدات ، خوای پشت و پەنا بێ لە مەیدانی خەباتی فیکری و سیاسی و چەکدارانەدا بە پەریزو بەرهەم دەیسەلمێنێ کە کۆمەڵی خودا ( حزب الله ) یەو بووژێنەرەوەی ئیسلام و نوێکەرەوەی ڕێ و شوێنی پێغەمبەری پێشەوا بە صلی الله علیه وسلم .

## پێناسەی بزووتنەوەی ئیسلامی لە چەند خالیك دا

************************************

یەکەم: شی کردنەوەو توێژینەوەی ناوەکەی

(( بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق دا ))

وەك دەبینین ئەم ناوە لە چوار وشەی سەرەکی پێکهاتوە:

١- بزووتنەوەی ٢- ئیسلامی ٣- لەکوردستانی ٤- عێراق دا

جا ئێستا بەشیکردنەوەو توێژینەوەی یەك یەکی ئەم چوار وشەیەدا دەچینەخوار:

وشەی یەکەم (بزووتنەوە)

*************

یەکەمین وشەی پێکهێنەری ناوی کۆمەڵی خوا ( حزب الله ) لە کوردستان دا بریتیە لە بزووتنەوە ( الحرکة ) چونکە خوای قسەلەجێ فەرموویەتی: (( وقل اعملوا فسیری الله عملکم ورسوله والمومنون وستردون الی عالم الغیب والشهادة فینبئکم بما کنتم تعملون )) التوبە- ١٠٥. واتە: وە- ئەی موحەممەد صلی الله علیه وسلم- بلێ کاربکەن - - ببزوون بجووڵێن ڕەنج بدەن - چونکە خواو پێغەمبەرەکەی و برواداران کردەوە -و پەرێزو بەرهەمە - کەتان دەبینن وە لەمەو پاش دەگێردرێنەوە بۆ لای - خوای - زانای پەنهان و ئاشکرا، جا هەواڵتان پێ دەدات بەوەی کە کردووتانە. وە ( العمل الصالح ) (٦٣) جاران لە لە قورئانێ دا لەگەڵ (ایمان) دا هاتوە.

بەڵێ کۆمەڵی خوا ( حزب اللە ) لە کوردستان دا بڕوای وایە کە ئیسلام واتە بزووتنو جووڵان و کارکردن و ڕەنج دان و خەبات و هەوڵدان و سەنگەرگرتن و جەنگان، چونکە وەك لە پێشەکی ئەم نووسراوەدا گوتمان، جووڵان و بزووتن (الحركة) مەرجی هەبوون و مانەوەی هەموو دیاردە سروشتی یەکانی ئەم بوونەوەرەیە، تەنانەت شتێکی پاك وبێگەردی وەك (ئاو) یش لەئەنجامی ڕاوەستان و نەبزووتن و بێ جموجوولی دا، لە ئاو دەشۆرێو بۆگەنیو دەبێ !! ئنجا لەڕاستی دا وشەی بزووتنەوە (الحركة) لەمێژە بۆتە ناوێکی گشتی و درووشمێکی سەربەخۆ بۆ هەموو ئەو کۆمەڵە مسولمانانەی کە دەیانەوێ ئیسلامەتی و ڕێ و شوێنی پێغەمبەر صلی اللە علیه وسلم نوێ بکەنەوەو ببووژێننەوەو بیهێننەوە نێو مەیدانی ژیان، بۆ وێنە : دەگوترێ ( بزووتنەوەی ئیسلامی لە ئەفغانستاندا ) یان ( بزووتنەوەی ئیسلامی لە میسردا ) یان ( بزووتنەوەی ئیسلامی لە فیلیپین دا )و ... وە هەروەها .

بەلام ئایا بزووتن و جموجووڵو چالاکی و خەباتی کۆمەڵی خوا ( حزب اللە ) لە کوردستان دا بە چ ناوێکەوەو لەژێر چ درووشمێک دایە؟! وشەی دووەم وەلامی ئەم پرسیارە دەداتەوە .

وشەی دووەم ( ئیسلامی )

*****************

بەڵێ بزووتن و کارکردن و ڕەنج و خەبات و جەنگی کۆمەڵی خوا لە کوردستاندا

بۆ ئیسلامەو بەناوی ئیسلامەوەیە، نە دیموکراتی نە کۆمۆنیزم ( الشیوعیة )

نە سۆشیالیزم ( الاشتراکیة ) نە ناسیۆنالیزم ( القومیة ) نە کاپیتالیزم (الرأسمالیة )

نە ئەگزیستانسیالیزم (الوجودیة ) نە مارکیوسیزم وە نە هیچ (ئیزم) دارێکی دیکەش !!

بۆچی ؟!

چونکە کۆمەلی مسولمان خودا پێی فەرمووە: (( ورضیت لکم الاسلام دینا .. )) المائدە ٣.

واتە : وە ئیسلامم بە بەرنامە بۆ هەلبژاردوون .

وە خودا پێی فەرمووە: (( ومن یبتغ غیر الاسلام دینا فلن یقبل منه وهو فی الاخره من

الخاسرین )) ال عمران . ٨٥ . واتە : وە هەر کەسێك جگە لە ئیسلام بەرنامەیەکی

دیکە بگرێ لێی وەرناگیرێ وە ئەو لە دوارۆژدا لە زیانبارانە .

ئنجا ئایا زەمینەو شوێنی کارکردن و بزووتن و چالاکی بزووتنەوەی ئیسلامی چی یەو

کوێ یە؟! ئەوە وشەی سێ یەم وەلاممان دەداتەوە .

وشەی سێ یەم ( لە کوردستانی )

**************

بەلێ هیچ جموجوول و بزووتنەوەو شۆرشێك بە زەمینەو شوێنێکی گونجاوو لەبار

ناچێتە سەر، جا لەبارترین و گونجاوترین شوێن و زەمینەی خەبات و تێکۆشان بۆ

خەلکی مسولمانی کورد، نیشتمان و خاك و ئاوەکەی خۆیەتی کە ( کوردستان ) ە .

جا شتی سەیرو سەر سوورهێنەر . لەم رۆژگارەدا زۆرەو قسەی عەجایب و

بێ سەروپێ گەلێکن !!

یەکێک لەو شتە سەیروسەرسوورهێنەرو قسە عەجایب و بێ سەروپێ و ناماقووڵانە ئەوەیە کە هەندێک لەوانەی بیرو زەینیان زۆر پان و قووڵ و بەرین و بەرەوەبوو و بیرۆزایەو بە ( بزووتنەوەی ئیسلامی )ش رازی نین دەڵێن : چۆن دەبێ بڵێین ( بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستان دا ) !! خۆ ئیسلامەتی و مسوڵمانەتی بەس لە کوردستان دا نیە ! ئەوە بۆنی ناسیۆنالیزمی و ڕەگەزپەرستی لێ دێ !!!

ئێمەش دەڵێین ( انا لله وانا الیه راجعون ) کورد دەڵێ : ( لە بێ خەبەران کەشکەک سەڵاوەت ) !!! برالە پیاو نابێ لەبەر بیر پان و قووڵی و درشت بینی و دوور بینی یان وای لێ بێ ئاگای لە شتی وردیلەو گچکەو نیزیکیش ببڕێ و لەبەر خەڵکی ئاگای لەخۆی نەمێنێ، چونکە ئەوی بۆخۆی خێری نەداتەوە، بۆ خەڵکیش چی لەدەست نایەت و ( ئەگەر لە سووریش تێت دۆراند لە لابای بۆت تێ هەڵنایەتەوە ) .

ئنجا لەڕاستی دا هیچ ماقووڵ نیە ئینسان ناوێک لەخۆی بنێ کە لێی نەوەشێتەوە، وە نابێ ناوێکیش لەخۆی بنێ کە کەس نەیدۆزێتەوە ! ئایا ماقوولە تۆ زەمینەو شوێنی خەباتو چالاکیت کوردستان بێ و بڵێی : من بزووتنەوەی ئیسلامیم لە دنیایەدا !

وە ئایا ئەگەر وات گوت ئەگەر بە چرا وشەدا وانیش لێت بگەڕێن دەت دۆزنەوە ؟!
دیارە نەخێر چونکە دنیا زۆر پان و بەرینەوە کەلێن و کون و سووچ و قوژبنی زۆرن !!

ئنجا ئەگەر گریمان دۆزراشیەوە، ئایا قسەکەت وەدرۆ ناکەوێتەوە، کابرای بەدوادا .. گەڕاوو سووڕاوت پێت نالێ : مادام هەر لە کوردستان دا بزووتن وچالاکیت هەیە بۆچی

دەعوای وا گەورە دەکەی و ناوی هێندە زل لەخۆت دەنێ ی ؟!

ئەوە هەمووی لە لایەکەوە لە لایەکی دیکەشەوە ، ئێمە جلری جمو جووڵ و چالاکی و خەباتمان بەس لە جوغزو زەمینەی کوردستان دایە ، بۆیە دەڵێین ( بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی .. ) جا ئەگەر خوا کردی گەشەمان کردو جوغزو زەمینەی جەنگ و خەباتو تێکۆشانمان فراوان بوو و هەموو عێراقی گرتەوە ، ئەودەمی دەڵێین :( بزووتنەوەی ئیسلامی لە عێراق دا ) وە ئەگەر کەرتی ئاسیای گرتەوە دەڵێین( ...لە کەرتی ئاسیادا ) دوایش کە هەموو جیهانی تەنی یەوە دەڵێین :( بزووتنەوەی ئیسلامی لە دنیادا ) .

لەکۆتایی توێژینەوەی ئەم وشەی سێ یەمەدا تێ بینی یەك ماوە ، حەزدەکەم بیخەمەروو، ئێمە نەمان گوتوە ( بزووتنەوەی ئیسلامی کوردستانی )بەڵکو گوتومانە ( ....لە کوردستانی) ئەم دوو وشەیەش جیاوازی یان زۆرە ، هەرچی یەکەمیانە ، بزووتنەوەی ئیسلامی لەسەر کوردستان کورت هەڵدێنێ و تایبەتی دەکات بە گەلی کوردەوە ، واتە ئەو بزووتنەوەیە بەس ئی کوردستانەو تەنیا خەڵکی کوردستان تێیدا بەشدارن ، بەلام ئی دووەمیان جوغزو سنووری بزووتنەوە هێندە لێك دەکێشێتەوەو فراوانی دەکات کە جێ ی هەموو مسولمانێکی تێدا ببێتەوە ، سەر بە هەر گەل و نەتەوەیەك بێ ... بەس ئەوەندە هەیە بۆ ئەوەی پێچەوانەی واقیع نەبێ و ناوی لە ناوبراو( مُسَمّیٰ ) زلتر نەبێ! زەمینەو شوێنی خەباتو چالاکی بزووتنەوەی دیاری کردوە ، لەو پارچە زەوی یەی خوادا کە ئێستا بەدەستیەوەیەتی و

مەودای جم و جووڵ و چالاکی تێدا هەیە .

لەم ئەندازەیەش پتر بە پێویستی نازانم شتی روون بکەمەوە و بەڵگە بۆ شتی بەڵگەنەویست بێنمەوە ( کەسێکیش کەسە کەمێکی بەسە ) .

ئنجا بێینە سەر توێژینەوەی وشەی چوارەم :

وشەی چوارەم ( ..عێراق دا ) .

**************

لە راستی دا ئێمە عورف و روون کردنەوەی مەبەست و حاڵی کردنی خوێنەر ناچارمان دەکات کە بڵێین ( کوردستانی عێراق ) دەنا پێمان وایە پاڵدان ( اضافە ) ی کوردستان بۆلای عیراق ، هەرچەندە لە لایەنی رێزمانی یەوە راستە!! بەلام لە لایەنی عەقل و .... شەرعەوە هەڵەو بێ مەعناو ناڕەوایە !!

چونکە خودا هەر گەل و نەتەوەیەکی خولقاندوە ، خاك و ئاو و نیشتمانێکی تایبەتی و سەربەخۆشی بۆ دیاری کردوە و ، لەراستیدا نەتەوە ( شعب ) ی بێ نیشتمان هیچ مەعنای نیەو ، وشەیەکی ئەفسانەیی یە ، وەك باڵندەی ( سیمرغ ) !!

بەڵێ کە خوای دادگەر فەرموویەتی( وجعلناكم شعوباً وقبائِلَ لِتعَارفُوا .. ) الحجرات-١٣ وە گێڕا ومن بەچەند گەل و تیرەیەك تا یەکدی بناسن ، لەهەمان کات دا کە رای گەیاندوە دابەش بوونی مرۆڤایەتی بۆچەند نەتەوەو هۆزێك بەپێی ویستی خودایە ، راشی گەیاندوە کە کوردستان مولکی تایبەتی نەتەوەی کوردەو ، ئەفغانستان مولکی ئەفغانی یەکانەو ...هتد .

چونکە لای کەمی مەرجی هەبوونی هەر نەتەوەیەک : زمانێکی تایبەتی و نیشتمانێکی سەربەخۆیە ، جا بێگومان گەلی کورد زمانی تایبەتی خۆی هەیە کە ( کوردی ) یە ، کەواتە دەبێ نیشتمانی تایبەتی و سەربەخۆی هەبێ ئەویش ( کوردستان ) ە •

کەواتە : لەت لەت کردنی نیشتمانی کورد لەنێو چەند دەولەتێک دا و ، دابەش کردنی نەتەوەی کورد بەسەر چەند نەتەوەیەکی دیکەدا شتێکە پێچەوانەی قورئان و عەقل و واقیعی شتانە •

لە بەندی یەکەمی خالی هەشتەمیش دا چاکتر هەلوێستمان سەبارەت بە مەسەلەی کورد روون دەکەینەوە (1) •

جا پوختەی مەبەست ئەوەیە ئێمە کە دەلێین ( بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عیراق دا ) وەنەبێ بمانەوێ دان بنێین بەراستی و تەواوی ئەو نەخشەو پیلانە نائیسلامیو ستەمکاری یەی ئیمپریالیزمی جیهان خۆردا ، کە گەلی کوردی دابەش کردوە بەسەر سێ نەتەوەی دراوسێ ی داو ، نیشتمانی کوردی کردۆتە چوار لەتەو هەر لەتکەی داوەتە دەولەتێک !!

---

(1) ( سۆزی نەتەوایەتی ) کە ئالقەی چوارەمی زنجیرەی ( ئیسلام و رێچکان ) ە تەرخان کراوە بۆ توێژینەوەو لێکۆلینەوەی مەسەلەی نەتەوایەتی •

بەڵکو لەبەر ئەوەی ئێمە ئێستا زەمینەی خەبات و تێکۆشانمان ئەو بەشە کوردستانە نەبە

کە بە ناڕەوا دراوەتە دەوڵەتی عێراق بۆیە ئەو وشەیە بەکاردێنین .

ئێستاش نۆرەی خاڵی دووەمە :

دووەم (بزووتنەوەی ئیسلامی لەکوێ پێکهاتوە ؟!

گەلێک جاران گوێ بیست دەبین، کە خەڵکی سادەو عەوام پێمان دەڵێن (کۆمەڵـــی

مامۆستایان) یان (کۆمەڵی مەلایان) هەشە دەڵێ هەر گەنجن و پیاوی کامڵ و پیریـان

لەگەڵ دا نین ! یان دەڵێن ئەوانە هەر قوتابین و مەلایان لەگەڵ دا نین !

جا ئایا بزووتنەوەی ئیسلامی کێ یەو لە چ چین و توێژێك پێك هاتوە ؟ !

لەوەلامدا دەڵێین :

( بزووتنەوەی ئیسلامی ) لەهەموو مسوڵمانێکی ڕاست و ساغ پێکهاتوە، مەلاو فەقێ

بێ، قوتابی مەکتەبی بێ، کریکارو جوتیار بێ، بازرگان و سەپان بێ، کاسبکارو شوان بێ

خوێندەوار بێ، نەخوێندەوار بێ، پیر بێ، گەنج بێ، ئافرەت بێ، پیاو بێ (١) .

وە لەڕاستی دا واقیعی بزووتنەوەی ئیسلامیش هەر وایەو، هەموو ئەو جۆرە کەسانەی

تیدا دێنە بەرچاو کە گوتمان . بەکورتی ئێمە هەر مسوڵمانێك ئەم سێ خەسڵەتە ....

بنەڕەتی یەی تێدابن بە پێشمەرگە لە بزووتنەوەی ئیسلامی دا وەری دەگرین :

---

(١) بێگومان ئێمە بروامان بەوە نیە ئافرەت سەنگەری بگرێ، بەلام ئەویش لە بواری خۆیدا

دەتوانێ ( جیهاد ) بکات .

١- زانیاری و شارەزایی دەربارەی ئایینەکەی، کە لای کەمی ئەوەیە بڕوای تەواوی هەبێ لەسەر ڕاستی و بێ خلەتەیی ئیسلام و، پووچی و قڕپۆکی غەیری وی.

٢- تەقوا و یەکلابوونەوەی بۆ خوا، واتە بەڕێوەچوونی بەپێی ڕێ و شوێنی پێغەمبەر صلی علیه وسلم و خۆپاراستن لە تاوان و سەرپێچی گچکەو گەورە.

٣- ئازایەتی و جەرگ، بەڵێ زانیاری بێ فیداکاری و تەقوای بێ تەقە، نە ئەمڕۆ بەکەلکی ئیسلام دێ و نە قەتیش بەکەلکی هاتوە.

ئێستاش دەچینەسەر خاڵی سێیەم:

<u>سێیەم</u> (کێ ڕابەرایەتی و چاوساغی ی بزووتنەوەی ئیسلامی دەکات؟!

وەک لە خاڵی دووەمدا گوتمان بزووتنەوەی ئیسلامی لە هەموو چین وتوێژەکانی ... جەماوەری مسوڵمان پێکهاتوە، هەڵبەتە ڕابەرو چاوساغ و براگەورەی مسوڵمانانیش لەسەر بنچینەی ڕاویژ (شوری) و پرس و ڕای مسوڵمانان هەڵدەبژێردرێ، وەک خودا فەرموویەتی: (... وامرهم شوری بینهم ...) الشوری - ٣٨. واتە:

وە کاروباری - مسوڵمانان - ان بەپێی ڕاویژە لەنێو خۆیان دا. جا بێگومان هەڵبژاردنی ڕابەرو چاوساغیش گەورەترین و گرنگترین کاروباری مسوڵمانانە، مادام وابێ دەتوانین بڵێین: ئەوکەسە ڕابەرایەتی و براگەورایەتی بزووتنەوەی ئیسلامی دەکات کە مسوڵمانان لەنێو خۆیان دا پەسندی دەکەن و هەڵی دەبژێرن بەگوێرەی ڕێژە (نسبة) ی ئەو خەسڵەتە گرنگ و پێویستانەی کە قورئان و سووننەت کردوویانن بە سەنگی مەحەک و تەرازووی ....

مسولمانەتی کە سەرەکی و بنەڕەتی یەکانیان ئەمانەن :

زانیاری ( العلم ) و لێزانی ( الخبره ) .(قل هل یستوی الذین یعلمون والذین لایعلمون) الزمر٩ .

پارێزکاری ( التقوی ) و ساغ بوونەوە ( الاخلاص ) (ان اکرمکم عند الله اتقاکم) الحجرات - ١٣

ئازایەتی ( الشجاعه ) و لێبڕان (التضحیة) ( ..ولم یخش الا الله) التوبه - ١٨ .

کە (واتە کێ پتر پشکی لەم خەسڵەتە بەرزانەدا هەبێ، ئەوە بە بارتەقای ڕێژەی پشک و بەشەکەی شایستەیی و لێهاتوویی خۆی بۆ رابەرایەتی و چاوساغی بە ئیسپات دەگەیەنێ ، بێ ئەوەی گوێ بدرێتە ، ناوو شۆرەت و سەروسیماو جل و بەرگ و بنەماڵەو رەچەڵەك و ... هتد .

هەڵبەتە ئەگەر سەرنجی قورئانی بەڕێزیش بدەین دەبینین هەر بەهەمان سەنگی مەحەك ئەو کەسانەی دیاری کردوون کە بۆ رابەرایەتی و پێشەوایەتی بڕوادارن هەڵی بژاردوون ، بۆ وینە: لەسەر زمانی یەکێك لە پێغەمبەرانی ( بنی اسرائیل ) سەبارەت بە هەڵبژاردنی ( طالووت ) بۆ سەرکردایەتی سوپا فەرموویەتی :(ان الله اصطفاه علیکم وزاده بصطة فی العلم والجسم ..) البقره - ٢٤٧ . واتە : بێگومان خوا بەسەر ئێوەدا هەڵبژاردوەو لە زانیاری و .. هێزو پێکراوی - جەستەدا زیادەیداوەتی .

وە دەربارەی حیکمەت و هۆی هەڵبژاردنی پێشەوایانی ( بنی اسرائیل ) فەرموویەتی ( وجعلنا منهم ائمة یهدون بأمرنا لما صبروا وکانوا بآیاتنا یوقنون) السجده ٢٤

واتە : وە چەند کەسێکمان تیدا گێڕان بە پێشەوا، کە بە فەرمانی ئێمە ڕێنمووونی

- خەڵکی - یان دەکرد، لە سۆنگەی ئەوەوە کە خۆڕاگر بوون و بڕوایەکی پتەویان بە .... ئایەتەکانمان هەبوو .

وە دەربارەی ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب کە سێ پێغەمبەری هەڵبژاردەی خوا بوون علیهم الصلاه والسلام فەرموویەتی : ( واذکر عبادنا ابراهیم واسحق و یعقوب أولی الایدی والابصار ) ص- ٤٥ . واتە : وە یادی بەندەکانمان ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب بکەوە، خاوەنی تین و هێزو شارەزایی بوون .

وەك دەبینین لە هیچ کام لەم ئایەتانەدا کەم و زۆر مەسەلەی : ناوو شۆرەت و جل و بەرگ و سەرو سیما و بنەماڵە و ڕەچەڵەك و ..هەند نەهێنراونە نێو حیسابانەوە و بە سەنگی مەحەك و تەرازووی هەڵسەنگاندن و مەرجی هەڵبژاردنی ڕابەرو سەرکردەو چاوساغان دانەنراون .

چوارەم ( بزووتنەوەی ئیسلامی ئامانج و مەبەستی چی یە ؟!)

لەڕاستی دا بزووتنەوەی ئیسلامی دەیەوێ خەت و ڕێبازی پێغەمبەران صلی الله علیهم وسلم ببووژێنێتەوەو درێژە پێ بداتە، مادام وابێ ئامانج و مەبەستێکیش کە لە دلی خۆی گرتوەو ئاوات و هیوای وەدی هێنانی لەسەری دا هەڵگرتوە، هەمان ئامانج و مەبەستی بەرزو پیرۆزە کە تێکرای پێغەمبەرانی خوای علیهم الصلاه والسلام بۆهاتوون کە بریتیە لە چەسپاندنی دادگەری، وەك خوای میهرەبان و دادگەر فەرموویەتی : (لقد ارسلنا رسلنا بالبینات وانزلنا معهم الکتاب والمیزان لیقوم الناس بالقسط وانزلنا

الحديد فيه بأس شديد ...) الحديد - ٢٥ . واته : بێگومان پێغەمبەرانی خۆمانمان

بە موعجیزانەوە رەوان کردوون ، وە کتێب و تەرازووشمان لەگەڵ ناردوونە خوارێ تاکو

خەڵک بەدادگەری بەرێوە بچن وە ئاسنمان خولقاندوە هێزێکی توندی تێدایە ..

بەڵێ ئامانج و مەبەستی نێررانی تێکرای پێغەمبەران علیهم الصلاه والسلام هەر

ئادەمەوە تا خاتەم، ئەوە بووە کە واقیعی دزێوو ناقۆڵای پرستەم و خراپەو چەوساندنەوە (

چینایەتی و قڕی و پڕی گەلان ، کە بەهۆی رژێم و بیرو بۆچوونە نەفامی و طاغووتیەکانەوە

پەیدا بووە، بگۆڕن بە واقیعێکی رێك و پێك وکۆمەڵگایەکی دڵگیر کە دادگەری و .....

یەکسانی و ئازادی و چاکەکاری و برایەتی و تەبایی؛ چەند دیاردەیەکی زەق و بەرچاوینی . لـــــە

بەلام بێگومان طاغووت و زۆرداران خۆ بەخوا زانەکان وەنەبێ هەروا بەسێناییی

تەخت و کورسی حوکمی ستەمکارانەیان بێنە خوارێ و واز لە چەوساندنەوەو خوێن

میسین بێنن ، جا بۆیە قورئان دوا بەدوای خستنەرووی ئامانج و مەبەستی پێغەمبەران

علیهم الصلاه والسلام کە چەسپاندنی دادگەری ( عدالة ) یە دەفەرموێ :( وانزلنـــا

الحدید فیه بأس شدید ..) تاکو تێمان بگەیەنێ کە ئێمەی کۆمەڵی خوا ( حزب اللـــه )

و ئێمەی شوێن کەوتووی پێغەمبەران دەبێ لەبەرانبەری مستێدا دڕیشە بۆ طاغووت و

زۆرداران راگرین و زۆرچاك بزانین کە ( کوتەك لەبەهەشتێ راهاتوە ) و خــــوا

نیعمەتی ئاسنی پێ بەخشیوین کە هێزو توانا و دەستەلاتی لێ دروست بکەین بیکەینە

پاڵپشت و پاسەوانی ئەو ئایین و بەرنامەیەی کە بە خوێنی زۆردارو چەوسێنەرو خوو

بەخوازانان تینووەو ئەوانیش بە خوێنی تینوون !!

وەك گوتمان ئامانج و مەبەستی بزووتنەوەی ئیسلامی چەسپاندنی دادگەری بە جیا

بێگومان دادگەریش چەسپانی . مەحاڵە بەبێ لەنێوبردنی زۆرداران و رزگارکردنی

چەوساوان، بۆیە خوای زانا پێمان دەفەرموێ: ( وما لكم لا تقاتلون في سبيل الله

والمستضعفين .. ) ؟ النساء - ٧٥ . ئەوە بۆچی لە رێی خواو چەوساواندا ناجەنگن؟!

وەك دەبینین خوای میهرەبان رێی خۆی و چەوساوان وەك دوو دیوی دراوێك پێشمان

دەدات: ( سبيل الله . المستضعفين ) رێی خوا . چەوساوان .

ئەم جۆرە تەعبیرەش ئەگەر هیچی لێ بفامرێتەوە ئەوەیە کە خودا ئەوپەڕی رێزو

حورمەت و لەسەرکردنەوەو وەدەنگ هاتنی خۆی رادەگەیەنێ سەبارەت بە خەڵکی ستەم

- دیدەو چەوساوە .

وە لە کۆتایی دا ئامانجی ئێمە ( بزووتنەوەی ئیسلامی ) ئەوەیە کە خودا لە

سوورەتی ( الحج ) دا فەرموویەتی: ( الذين ان مكناهم في الأرض اقاموا الصلاة وآتوا

الزكاة وامروا بالمعروف ونهوا عن المنكر ولله عاقبة الامور ) ٤١ . واتە:

ئەوانەی کاتێك لە زەوی دا دامان مەزراندن - و دەسەلاتمان دانە دەست - نوێژی بەرپا

دەکەن و زەکاتی دەدەن و فەرمان بە چاکە دەکەن و رێگری لە خراپە دەکەن وەسەرەنجامی

کاروباران ئی خودایە . ٥٧

بەڵێ ئامانج و مەبەستی بزووتنەوەی ئیسلامی هێنانەدی کۆمەڵگایەکی وایە کە نوێژ

ـ کردن و زەکات دان و چەسپاندنی چاکەکاری و نەهێشتنی خراپەکاری نرووشم و ...

نیشانەی هەرە زەق و بەرچاونی • (1)

کورتەی قسان ئەوەیە : کە ئامانج و مەبەستی ئێمە چەسپاندنی حوکم و بەرنامەو

پەیڕەوی خودایە ، ئەو بەرنامەو پەیڕەوەی کە هێنانەدی هەموو خێرو خۆشی و بەرژە

ـ وەندی یەکی تاك و کۆمەڵی لەگرەودایە ، لە هەموو بوارو لایەنەکانی ژیان دا ، سیاسی و

کۆمەلایەتی و ئابووری و .. هتد •

پێنجەم ( پشت و پەنای بزووتنەوەی ئیسلامی کێیە ؟! )

خوای بێ وێنە فەرموویەتی :( لقد کان لکم فی رسول الله اسوه حسنه )

الاحزاب ـ ٢١ • واتە : بێگومان لە پێغەمبەری خوادا سەرمەشقی و ڕابەرایە

ـ تی یەکی باش هەیە بۆتێوە •

بەڵێ پێغەمبەری ڕابەر صلی الله علیه وسلم خودا کردوویەتی بە ڕابەرو پێشەواو

سەرمەشقمان لە هەموو کاروبارێکمان دا ، جا با بزانین پێغەمبەری ڕابەرو پێشرەومان

پشتی بەکێ بەستوەو کێ ی بە پشت و پەنای خۆی لەقەلەم داوە ؟!

---

(1) لێرەدا ئامانج و مەبەستی ڕواڵەتی و ماددی و بەرچاوە ، لەبەرچاو گیراوە دەنا ..
مەبەست و ئامانجی دەروونی و مەعنەوی و پەنهانی ئێمە تەنیا وتەنیا وەدەست هێنانی..
ڕەزامەندی خودایە •

خوای بێ هاوەڵ پێی فەرمووە :( یا ایها النبی حسبك الله و من اتبعك من المؤمنین ..) الانفال ب ٦٤ . واتە ئەی پێغەمبەر خودات بەسەو ئەوانەی کە بەدات کەوتوون لە بڕواداران .

کەواتە : پێغەمبەرمان صلی الله علیه وسلم دوو شوێنی هەبوون کە پشتیان پێ وەدا و بە پشت و پەنایان لەقەڵەم بدات ؛ یەکەم: خودا دووەم: بڕواداران .

جا ئێمەش ( بزووتنەوەی ئیسلامی ) کە شوێن کەوتووی پێغەمبەرین صلی الله علیه وسلم هەر ئەم دوو جێیا تە شك دەبەین .

بەڵێ بزووتنەوەی ئیسلامی لەسەر لاقی خۆی راوەستاوەو پشتی بەستوە بە خوداوە، وە بڕواشی پتەوە بەوەی کە هەر بزووتنەوەو کۆمەڵێك لەسەر لاقی خۆی رانەوەستێ و پشت بەخواو خۆی نەبەستێ ، تەمەنی کورت دەبێ و سەرەنجام - ئەگەر گەیبێتە بەرز - ترین پلەش - هەر سەرەنگری دەبێ ، چونکە ( بەرەی خەڵکی هەردەبێ لەسەری هەستی) بەلام هەڵبەتە ئێمە دەست بە رووی هیچ کەسێکیشەوە نانێین کە لەبەر خوا یارمەتیمان دەداو کۆمەکیمان پێ دەکات ، گرنگ ئەوەیە ئێمە ئازادی و سەربەخۆیی خۆمان لەدەست نەدەین وە ئەو ئەرکەی دەیکێشین بەرهەمەکەی لەگیرفانی یەکێکی دیکە نەکەین !!

**شەشەم** ( بەرنامەو پەیرەوی بزووتنەوەی ئیسلامی چی یە ؟! )

بەرنامەو پەیرەوی ئێمە دوو سەرچاوە روونەکەی ئیسلامە - قورئان و سوونەتە وە ئەو کەلەپوورە رەسەنەیە کە قەڵەمی بەپێزی زاناو پێشەوایانی تێکۆشەرو

خەباتگێر وەك شەرح و تەفسیر و ڕوونكردنەوە و لێكدانەوەی قورئان و سووننەت بەرهەمی هێناوە. خوای بەرزو مەزنیش فەرموویەتی: (ومن یطع الله والرسول فاولئك مع الذین انعم الله علیهم من النبیین والصدیقین والشهداء والصالحین..) النساء - ٦٩

واتە هەركەسێك فەرمانبەری خودا و پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بكات ئەوە ئەوانە لەگەڵ ئەو كەسانەدا كە خوا چاكەی لەگەڵ كردوون - و نیعمەتی بەسەردا ڕشتوون- لە پێغەمبەران و بڕواپتەوان و شەهیدان و چاكان..

پێغەمبەری رابەریشمان صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (.. إنّي قد تركتُ ما إن اعتصمتُم به فلن تَضِلُّوا بَعْدي أبداً كتاب الله وسنّة نَبيِّه) اخرجه الحاكم .... والبیهقی وابن عبد البر. واتە:

بێگومان من شتێكم لە نێوەدا بەجێ هێشتوون ئەگەر دەستی تێ بگرن ئەوە قەت سەر گەردان نابن؛ كتێبی خودا و ڕێ و شوێنی پێغەمبەرەكەی صلی الله علیه وسلم.

## دەوتەم ( گرنگی و پێویستی هەبوونی بزووتنەوەی ئیسلامی )

گومانی تێدا نیە كە هەبوونی بزووتنەوەی ئیسلامی ئەرك و پێویستی یەكی شەرعی یە لە نێو هەر گەل و كومەڵێك دا كە خۆیان بە بەندەی خوا و شوێن كەوتووی پێغەمبەری پێشەوا صلی الله علیه وسلم دەزانن؛ چونكە ئیسلام عیبادەت و .... سیاسەت و دواڕۆژ و دنیا و تەقوا و غەزا و مزگەوت و بازاڕ و فرمێسكی چاو و خوێنی هەناوو.. هتد پێكەوە گرێ دەدات ئایین و بەرنامەیەكی واش مەحالە بەبێ بزووتن و

جوولان و خەبات و ڕەنج دان بگونجێ بچەسپێنرێ و بەڕێوە ببرێ .

ئەوە لە لایەکەوە لە لایەکی دیکەشەوە دەڵێین : گرنگی و پێویستی هەبوونی بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستان دا و لە هەر پارچەیەکی دیکەی نیشتمانی ئیسلامی دا ، بە ئەندازەی گرنگی و پێویستی ( هەوێن ) ە بۆ مەیین و بوونە ماستی شیر !!

چونکە لە مێژە گەلی کوردی مسوڵمانی چەوساوەو نیر لەسەرشان بزووتنەوەو ڕاپەڕین و شۆڕش و تێکۆشانی بێ وچانی لێ دەبێتە شیری هەڵگەڕاوو هەڵبزرکاو ، لەبەر نەبوونی هەوێنی ئیسلام و بزووتنەوەی ئیسلامانە !!

هەشتەم : ( بیروڕاو هەڵوێستی بزووتنەوەی ئیسلامی دەربارەی چەند مەسەلەیەک )

١- مەسەلەی کورد :

ئێمە گەلی کورد بە ستەمدیدەترین و بەشخوراوترین و چەوساوەترین نەتەوەی سەرزەوی دەزانین ، وە ڕزگارکردنی لەو واقیعەی ئێستای بە گرنگترین و سەرەکی ترین ئەرکی سەرشانمان دەزانین ، وە لە دوو ڕێ یان بەولاوە بە ڕەوا نازانین بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد : یەکەم : کوردیش وەک هەموو گەل و نەتەوەکانی دیکە لە خاک و ئاوو نیشتمانی خۆی دا ئازادو سەربەخۆ بێ و خاوەنی دیاری کردنی چارەنووسی خۆی بێ . بەکورتی ئەویش کیان و قەوارەو بوونێکی هەبێ و خاوەنی دەوڵەت و دامو دەزگای خۆی بێ .

دووەم : ئەگەر دەوڵەتێکی ئیسلامی بەرفراوانی( تەواو !!) دروست بێ کوردستانیش ناوچەیەک و

ویلایەتێك بێ لەو دەوڵەتەو هەموو كاروباریكی خۆی، خەڵكەكەی خۆی هەڵی سووڕێنن و بەرێوەی بەرێ .

بەڵێ ئێمە لەم دوو رێ یە بەولاوە هیچ رێ و چارەسەری دیكەمان بەبیردا نایەت كە ئیسلام بە شتێكی رەوا و شەرعی بزانێ، بۆ كوردو هەر گەلێكی دیكەی وەك ویش ئەگەر هەبێ !!

ک- پێرو تاقمە نەیارەكانی رژێم لە كوردستانی عیراق دا :

هەرچەندە لە تێڕوانین و .. بیروباوەڕدا لێك جوێین، بەلام لەسۆنگەی ئەوەوە كە ئێستا لەگەڵمان دا هاوئامانجو هاوسەنگەرن، بە هاوكارو دۆستی خۆمانیان دەزانین و دژایەتی هیچ كامیان ناكەین وەئەوی بەنا هەقیش یەخەمان بگرێ، خوا بیگرێ و، با سووربزانێ شەڕی خۆتریێن دەكاو بە دەندووكێ پێوە دەبێ .

٣- بزووتنەوە ئیسلامی یەكان :

بە دۆست و برای خۆمانیان دەزانین وە بە ئەندازەی .. پابەندی یان بە قورئان و سوونەتەوەو خەبات و تێكوشانیان خۆشمان دەوێن و .... رێزیان لێ دەگرین .

٤- كۆماری ئیسلامی ئێران :

بە دەولەتێكی ئیسلامی دەزانین و بەئەندازەی ئیسلامی ی .. بوونیشی رێزی لێ دەگرین وە دەشزانین كە ئیسلامی لە جوغزی مەزەبی( شیعە )دا قبووڵە .( وەرە بەە ١٥)

٥- ڕژێمی عەفلەقی و وابەستەکانی :

دوژمنی ژمارە یەك و بنەڕەتی مانەو لابردنی ئامانجی بەرزمانەو، تا ڕووخاندنی یان دوا تنۆکی خوێنمان لەگەڵی دەجەنگین .

٦- مەزهەبەکان ( المذاهب ) :

جێی ڕێزو حورمەتمانن و بەکەلەپوورێکی ڕەسەنی ئیسلامیان دەزانین . وە لەسەر هەر مسوڵمانێکی بەپێویست دەزانین کە پابەندی یەکێك لەو مەزهەبانە بێ کە لەنێو ( اهل السنە ) دا جێی متمانەو ئیعتیبارن مەگەر گەیبێتە پلەی کۆشش و هەڵهێنجان ( الاجتهاد والاستنباط ) .

٧- پێشەوایانی ئایین :

ئەگەر ڕاست و تەواوو واقیعی بن، بە ڕابەرو پێشەوای خۆمان و جێگرو میراتگری پێغەمبەریان صلی اللە علیە وسلم دەزانین، وە ئەگەر لایان دا چۆن لە مەحەکی قورئان و سوونەت دەرچوون وایان دەقەبڵێنین .

٨- تەریقەت و سۆفیایەتی :

ئەگەر لە جوغزی قورئان و سوونەت نەچێتە دەرێ و خڵتەو خاڵی تێکەڵ نەبێ بە یەکێك لە لایەنە ڕەسەنەکانی ئیسلامی دەزانین، کە لایەنی گیانیو پەروەردەیی یە، بەلام کە لە شیرازەی قورئان و سوونەت چوو دەرێ و خڵتەی تێکەڵ بوو بە ئەندازەی لادانی و خڵتە لێهالانی ڕەفزی دەکەین .

٩- ناحەزانمان :

ناحەزانێك كە قسەمان دژ دەكەن یان نا مسوڵمانن یان مسوڵمانن، ئەگەر نا مسوڵمان بن ئەوە دژایەتی یەكەیان شتێكی سروشتی و چاوەڕوان كراوەو بەپێی توانا‌ش بەرپەرچی دەدەینەوە، بەڵام ئەگەر مسوڵمان بن یەكەم داوای شیفایان بۆ لە خوا دەكەین، دووەم هەوڵی تێگەیاندن و چاوكردنەوەیان دەدەین .

١٠- مەسەلەی نەتەوایەتی :

ئێمە خۆشەویستی مرۆڤ سەبارەت بە گەل و نیشتمانی بەشێكی خوا پێسك و سروشتی و ڕەوا دادەنێین و لەڕاستی دا پێچەوانەی ئەوە نیشانەی نەخۆشی و میزاج تێكچوونە، هەربۆیەش ڕابەرمان صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی :( ان أحدا جبل یحبنا و نحبه ) متفق علیه . واتە : بەڕاستی ئوحود شاخێكە خۆشی دەوێین و خۆشمان دەوێ ! بەڵام بەمەرجێك ئەو خۆشەویستی یە لە ئەندازەی سروشتی خۆی دەرنەچێ و هەر عاتیفەو سۆز بێ و نەبێتە بیروباوەڕ، ڕوونتر بڵێم وەك غەریزەیەكی سروشتی و سادە بێ و نەچێتە قالبی بت پەرستی یەوە، كەواتە ئێمە ( سۆزی نەتەوایەتی ) و نیشتمان پەروەری بەڕەوا دەزانین بەڵام ( بیری نەتەوایەتی) و گەل و خاك پەرستی ( ناسیونالیزم) نا .

١١- چەوساندنەوە :

لابردن و نەهێشتنی چەوساندنەوە کە پێچەوانەی ( دادگەری ) یە بە گەورەترین ئەرکی سەرشانمان و بەرزترین ئامانجی تێکۆشانمان دەزانین چونکە لەو .... رێیەوە نەبێ بەرنامەی خودامان بۆ بەرێوە نابرێ و ( دادگەری ) یمان بو ناچەسپێنرێ و لە سۆنگەی ئەوەشەوە خودامان بۆ رازی ناکرێ ، چونکە خودا رەزامەندی خۆی و رزگارکردنی چەوساوانی کردوونە دوو شتی پێکەوە جۆش دراو وەک فەرموویەتی :

( وما لکم لا تقاتلون فی سبیل الله والمستضعفین ..؟!) النساء / ٧٥ .

ئەوە بۆ لەرێی خوا - رزگاری ی - چەوساوان دا تێ ناکۆشن ؟!

١٢- چینایەتی :

بنەبرکردن و ڕیشەکێش کردنی چیناپەتی و ستەم و بێ دادی کە پێچەوانەی یەکسانی و ئازادی یە ، ئەرکی هەموو پێغەمبەران بووە ، ئیمەش بە ئەرکی سەرشانمانی دەزانین ، هەڵبەتە پەیدا بوونی دیاردەی چینایەتی و ( قری و پرکێ ) یش هەموو دەمێ فیتی طاغووتانەو ئاگرێکە لە ریشی حوکم نەکردن بە بەرنامەی خوا هەڵدەستێ ، وەک خودا فەرموویەتی :( ان فرعون علا فی الارض و جعل اهلها شیعا یستضعف طائفة منهم ) القصص /٤

بێگومان فیرعەون بەرزبوۆوە و دەستەڵاتی پەیدا کرد ـ لە زەوی دا ، وە دانیشتووانی گیرا

بە چەند چینێك کومەڵێکی لێ زەبوون کردن ـ و دەی چەوساندنەوە ... .

بەڵام پێویستە بزانرێ کە چەمك و واتای یەکسانی ( المساواه ) و ئازادی ( الحريه )

لە روانگەی ئیسلامەوە جیاوازە لە تێروانین و بیرو بۆچوونەکانی دیکە ، یەکسانی لـــــە

روانگەی ئیسلامەوە واتە ( نەمانی ئیمتیازە ناسروشتی یەکان ـ زوال الامتيازات الغيرطبيعيه )

بۆ وێنە : هیچ کەس بە سروشت ئاغاو ملکدار یان مسکێن و بێ ملك نیە ، کەواتە رژێمـــی

ئاغاو مسکێنی شتێکی نارەوایەو دەبێ لابچێ ، چونکە بەهۆی ئیمتیازە ناسروشتی یەکانەوە

هاتۆتەدی . خوداش فەرموویەتی : ( والارض وضعـها للانام ) الرحمن / ١٠ .

وە ـ خوا ـ زەوی بو خەڵکی رۆناوە . بۆ تێکرایان نەك بۆ مستە ئاغاو میرو بەگێك و باقـی

خەڵکەکەش قوڕەی زگیان بێ و زەقەی چاویان بێ و وەك کتکی برسی میاوە میاویان بێ !!

وە فەرموویەتی : ( كى لا يكون دولـه بين الاغنياء منكم .. ) الحشر / ٧ .

تاکو ـ ماڵ و سامان ـ لەنێو دەوڵەمەندەکانتان دا کورت هەڵنەیەت ـ و سەرمایەداری ی ..

پەیدا نەبێت ... .

وەئازادی یانی ئازادبوونی ئینسان لە سنووری ئیسلامدا ، نەك بەرەڵدایی و بێ بەنـمدو

باری و کەس بەکەسی ی ، کە بە ناهەق ناوی لێنراوە ( ئازادی ) !!

١٢- مەسەلەی ئافرەت :

هیچ کاتێك مەسەلەی ئافرەت لە ئیسلام دا کێشەو گیرو گرفتی لەسەر هەڵنەستاوە، بەڵکو کێشەو گیروگرفتی ئافرەت وەك هەموو دەردو نەخۆشی یەکانی دیکە دیاری ی کومەڵگای رۆژئاوا ( المجتمع الغربی ) یە . ئافرەتیش لە روانگەی ئێمەوە لە ئینسانەتی دا لەگەڵ پیاودا هاوتاو یەکسانە وەك دوو لەتکی سێوێك، یان دوو پێی تەرازوویێك، وەك پێغەمبەر فەرموویەتی :( النساء شقائق الرجال ) رواه ابوداود واحمد . ئافرەتان هاوتای پیاوانن . بەلام بۆئەوەی مافی ئافرەت پارێزراوبێ ئیسلام جۆرە ئەرکێکی پێ سپاردوە کە لەگەڵ سروشت و کەسایەتی ی دا دەگونجێ، ئنجا ئەوانەش کە دەڵێن دەبێ ئافرەت لە هەموو شتێك دا لەگەڵ پیاودا یەکسان بێ، ئەوانە دەیانەوێ - بەهەڵە یان بە ئانقەست - مافی ئافرەت بەزایە بدەن و کەسایەتی ی بپلیشێننەوەو بێ ناوی بکەن (١) !

---

(١) ئافرەت بۆیە ناوی ( ئافرەت ) ی لێنراوە چونکە ئەرکێك بەرێوە دەبات وەك دایکایەتی و ماڵداری و پەروەردەکردنی منداڵ و ...هتد جا بێگومان هەرکاتێك ئەو ئەرکانەی بەزایە دان لە ئافرەت دەشۆرێ و ناوەکەی لێ دەسرێتەوە، وەك ئێستا لە سایەی رژێمە نەفامی یە روژهەڵاتی و رۆژئاوایی یەکان دا جۆرە ئافرەتێك پەیدا بوون پێیان دەگوترێ : جینسی سێیەم ( الجنس الثالث ) واتە نە ئافرەت و نە پیاو، چونکە بەهۆی

چونکە مافی هەرکەسێك لەوەدایە کە بەگوێرەی سروشت و توانای ئەرکی پێ بسپێرری ، ئەو
کەسەش کە پێی وایە مافی ئافرەت لەوەدایە کە لە ئەرك و کارو هەموو شتێك دا لەگەڵ ...
پیاودا یەکسان بێ، وەك ئەو کەسە وایە کە پێی وایە مافی پزیشك ئەوەیە کە لەگەڵ
ئەندازیار ( مهندس ) دا یەك ئەرکیان هەبێ !!

١٤- زانیاری :

زانیاری و شارەزایی دەریارەی هەرشتێك بە گەورەترین چاکەو نیعمەتی
خوا دەزانین لەسەر مرۆڤ، چونکە لەڕێی زانیاری یەوە پەی بە یاساو دەستوورەکانی سروشت و
بوونەوەر دەبەین و لێیان بەهرەمەند دەبین، تاقە شتێکیش کە خودا بە پێغەمبەری
پێشەوامانی فەرمووە، داوابکە بۆت زیاد دەکەم، ( زانیاری ) یە !! وەك دەفەرموێ: ( و قل
رب زدنی علما ..) طه/١١٤ . وە بڵێ پەروەردگارم زانیاریم زیاد بکە !

---

خۆتی هەڵقورتاندیان یان خۆپێتێ هەڵقورتێنرانیانەوە لە کاروباری پیاو منداڵدانیان وەپاش
چۆتەوەو وێك هاتۆتەوەو منداڵیان نابێ، وە بەهۆی زۆر هەڵس و کەوت کردنیان لەگەڵ جیهانی
بێ ناتیفەو ڕەق و تەقی تەکنۆلۆجیاو کارگەو ئامێرەکانی دا لوتف و سۆزی ئافرەتانەیان
نەماوەو، بەکورتی بەهۆی لادانیان لە بەرنامەی خوداو سروشتی خۆیان لە ئافرەت شۆڕاون و
نەبوونە پیاو کەواتە بوونە شتێکی ( بێ ناو ) !!

دیسان هەتا پتر زانیاری بەرەوپێش بچێ و رازو نهێنییەکانی بوونەوەر زیاتر پەردەیان لەسەر لابچێ راستی ی بیری خواناسی پتر دەدرەوشێتەوەو چاکتر دەسەلمێنرێ، وەک خودا فەرموویەتی : ( سنریهم آیاتنا فی الافاق وفی انفسهم حتی یتبین لهم انه الحق .. ) فصلت / ٥٣ .

لەمەودوا لە ئاسۆیەکان - سەروویان - و نەفسی خۆیان دا نیشانەکانمان پێشان دەدەین تاکو بۆیان دەرکەوێ کە ئەو - خودا یاخود قورئان - راستە .

ان ارید الا الاصلاح ما استطعت وما توفیقی الا بالله علیه توکلت والیه انیب .



تەواو بوو -

٩/جەمادی دووەم/ ١٤٠٨ کۆچی

٢٨/کانوونی دووەم/ ١٩٨٨ زایینی

بناری قەندیل

[illegible]

✳✳✳✳✳✳✳✳✳✳

ئەم بەرهەمانە ئامادەی چاپن :

١- گەورەترین راستی / بەرگی یەکەم و دووەم

٢- سۆزی نەتەوایەتی / ئالقەی چوارەمی زنجیرەی ( دەبەرێک راچوونی ئیسلام و رێچکان )

٣- دادگەری کۆمەلایەتی / ئالقەی پێنجەمی زنجیرەی پێشوو

٤- ئافرەت لە سێبەری ئیسلامدا / ئالقەی شەشەمی زنجیرەی پێشوو

٥ - یادی خودا / بەرگی دووەم

٦- دیاردەی جاشەتی لە تەرازووی ئیسلامدا

٧- پێغەمبەران / ئالقەی دووەمی زنجیرەی ( با چاکتر ئیسلام بناسین )

٨- رۆژی دوایی / ئالقەی سێیەمی زنجیرەی پێشوو

٩- قەزا و قەدەر/ئالقەی چوارەمی زنجیرەی پێشوو

١٠- بروا ( الایمان ) ئالقەی پێنجەمی زنجیرەی پێشوو

١١- ئایین / ئالقەی شەشەمی زنجیرەی پێشوو

١٢- مسولمانی کامڵ / ئالقەی حەوتەمی زنجیرەی پێشوو

١٣- ئینسان / ئالقەی هەشتەمی زنجیرەی پێشوو

١٤- ژیانی دنیا / ئالقەی نۆیەمی زنجیرەی پێشوو

١٥- سیاسەت / ئالقەی یازدەیەمی زنجیرەی پێشوو

١٦- دادگەری / ئالقەی دوازدەیەمی زنجیرەی پێشوو

تێبینی :

هەرچەندە ئەم نووسراوە ئالقەی دەیەمی ئەم زنجیرەیەیە بەلام لەبەر گرنگی و پێویستی نۆرەبری بۆکرا .

# ناوەڕۆک



بە مەبەستى چاكتر بەهرە وەرگرتن و سوودمەندبوون لەم نووسراوە ـ كە ئالقـــــەى دەيەمى زنـجيرەى ( با چاكتر ئيسلام بناسين ) ە ـ و لە هەموو نووسراوەكانى ديكـــەى ئەم زنجيرەيە، پێشنيارى دەكەم كە برايانى مسوڵمان لەنێو خۆيان دا بە دەرس بيخـــوێنن، بەتايبەتى ئەندامو پێشمەرگە بەڕێزو فيداكارەكانى بزووتنەوەى ئيسلامى .

تـــەواو بوو



چاپخانەى شەهيد ( حسن البنا )

## ئەم نووسراوە

ئاڵقەیەکە لە زنجیرەیەک کە خوای زانا پشتیوان بێ بۆ چاکتر ڕوونکردنەوەی ئیسلام‌و پتر ناساندنی بە خەڵکی موسڵمانی کورد نووسراوە ٠

جا ئەی کوردی موسڵمان تۆ ئاڵقە یەک لەدوای یەکەکانی ئەم زنجیرەیەو موتاڵای وردو قووڵ و حاڵی بوون و کار پێ کردن و لە خەڵک گەیاندنیان !!



نرخی ( ٩٠٠ ) فلسە

چاپخانەی پێشەوای شەهید / حسن البنا